

# تەکنیکی نووسینی میدیایی

[illegible] نووسینی هەواڵ، [illegible]، چاوپێکەوتن، [illegible] و وتار لە
رۆژنامە و رادیۆ و TV و میدیای ئەلیکترۆنی



هاوژین عومەر

# تەکنیکی نووسینی میدیایی

**ڕێبەری پراکتیکی نووسینی**

**هەواڵ، ڕیپۆرتاژ، بەدواداچوون، چاوپێکەوتن، پۆرترێت، دەنگوباس و وتار لە**

**ڕۆژنامە و ڕادیۆ و TV و میدیای ئەلیکترۆنی**

**هاوژین عومەر**

MUKIRYANI
ESTABLISHMENT FOR RESEARCH & PUBLICATION

هەولێر - ٢٠١٣

خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

● تەکنیکی نووسینی میدیایی (رێبەری پراکتیکی نووسینی هەواڵ، رێپۆرتاژ، بەدواداچوون، چاوپێکەوتن، پرۆترێت، دەنگوباس، و وتار لە رۆژنامە و رادیۆ و TV و میدیای ئەلکترۆنی

● بابەت: رۆژنامەوانی

● هاوژین عومەر

● نەخشەسازی ناوەوە و بەرگ: رێدار جەعفەر

● پیتچنین: نووسەر

● نرخ: (٣٠٠٠) دینار

● چاپی یەکەم : ٢٠١٣

● تیراژ: ١٠٠٠ دانە

● چاپخانە: موکریانی (هەولێر)

● لەبەڕێوەبەراتیی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٢٧٨٥) ساڵی (٢٠١٣)ی پێ دراوە.

زنجیرەی کتێب (٧٩١)

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# پێڕست

## پێشەکی:

ڕۆژانە لە هەرسێ جۆری میدیای کوردی، بینراو و بیستراو و خوێنراو، ژانرە جیاوازەکانی ڕۆژنامەوانی دەبینین، هەواڵ و بەدواداچوون و ڕاپۆرت و ریپۆرتاژەکان... تاد، فەزایەکی بەرچاوی زەمەنی و وەرەقیان داگیر کردووە، وەلێ ژمارەیەکی دەگمەنیان ستاندارده پیشەییەکانی نووسینیان تێدایە، و پڕۆفێشناڵانە بابەتەکان ئامادە و بڵاو دەکەنەوە.

بە داخەوە میدیای کوردی بە گشتی بە دەست کەمی بابەتی تازە و ناوازە دەناڵێنێ، پڕکردنەوە و لاسایی، بە فراوانی بەرچاو دەکەوێت، پڕکردنەوەی لاپەڕی بڵاوکراوەکان، و زەمەنی پەخشی رادیۆ و تیڤییەکان سیمایەکی دیاری ئەو میدیایەیە، زۆرینەی بابەتەکان لە رووی مەبنا و ماناوە ناتەواون، هۆکاری سەرەکیش پابەند نەبوونی میدیاکار و دەزگا ئیعلامییەکانە بە یاسا پڕۆفێشناڵەکانی نووسینی میدیایی. زۆرێك لەو نووسینانەی لە ژێر ناوی وتار بڵاودەبنەوە خاتیرەن و ئسلوبی ئینشائیان بەسەردا زاڵە، هەروەها بەدواداچوونەکانیش پێوەرە سەرەکییەکانی نووسینی بەدواداچوونیان تێدا بزرە و.....تاد، ئەم حاڵەتە هەندێك جار هەواڵیش دەگرێتەوە.

فاکتەرەکانی غیابی پڕۆفێشناڵیەت لە میدیای کوردی زۆر و جۆراو جۆرە، ئێرە جێگەی باس کردنی نییە.

ئەم چەند لاپەڕەیە هەوڵێکی پراکتیکییە بۆ ئاشنا کردنی میدیاکار و فێرخوازانی ڕۆژنامەگەری بە تەکنیکی نووسینی میدیایی پڕۆفێشناڵانە کە هەڵقوڵاوی بنەما زانستییەکانی داڕشتنی میدیاییە، لەم رووەوە جگە لە پشت

بەستن بە کۆمەڵێك سەرچاوە، سوودم لە ئەزموونی ١٤ ساڵەی خۆم وەك پەیامنێر و هەڵەچن و محرر و بەرپرسی لاپەڕە و وتارنووس و سکرتێری نووسین وەرگرتووە، هەروەها خوێندنی ماستەریشم لە زانکۆی بەیروت و بەشدار بوونم لە چەند خولێکی رۆژنامەوانی لە سەنتەری رۆژنامەوانی زانکۆی نێوبراو و سەردانی بەردەوامم بۆ دەزگا ئیعلامییەکانی ئەو وڵاتە، یارمەتیدەرم بوون لە موعالەجەکردنی زانستیانەی بەشەکانی ئەم کتێبە.

ئەم کتێبە رێبەرێکی پڕاکتیکییە، لە رێگەی پێناسەی کورت و نموونە هێنانەوە و راهێنان لە سەر نموونەکان، هەوڵم داوە خوێنەر بە تەکنیکی نووسینی میدیایی پرۆفێشناڵ ئاشنا بکەم، ئەم کتێبە بە پێچەوانەی زۆرینەی کتێبەکانی دی نەچۆتە سەر باسی پێناسە و گفتوگۆکردن دەربارەی لایەنە تیۆرییەکانی هەواڵ و بەدواداچوون و جیاوازی نێوان ریپۆرتاژ و چاوپێکەوتن و.... تاد، بەڵکە بە عەملی دەستی میدیاکاران دەگرێت تا پرۆفێشناڵانە بابەتەکانیان بنووسن.

دوور لە پیاهەڵدان دەتوانم بڵێم ئەم کتێبە سەرچاوەیەکی باشە بۆ فێرخوازانی رۆژنامەگەری و مامۆستایان و میدیاکاران، لە رووی عەمەلی و پیشەییەوە خزمەتێك بە فێرخوازان دەکات، کەرەستەیەکی مەنهەجی باشیشە بۆ مامۆستایان، هاوکات رێبەرێکی عەمەلیشە بە دەست میدیاکارانەوە، یارمەتیان دەدات لە دەستنیشان کردنی ئەو بابەتانەی بۆ بڵاوکردنەوە شیاون، هەروەها چۆنیەتی داڕشتنی ناوەڕۆکیان و دواتر دەرهێنان و پەخش کردنیان.

**نووسەر**

**١٢ی ئۆگستسی ٢٠١٣**

# بەشی یەکەم

## تایبەتمەندییەکانی نووسینی میدیایی

پێوەرەکانی بڵاوکردنەوە

کۆکردنەوەی هەموو پێوەرەکان لەیەك بابەتدا ! !

نووسینی رۆژنامەوانی سەرکەوتوو

بێلایەنی لە نووسینی میدیایدا

نووسینی رۆژنامەوانی دارشتنێکە  جیاوازە لە نووسینی ئەدەبی و زانستی، لەو شێوە نووسینەدا تەنها لە ژانری (وتار)نەبێ، فەزایەکی ئەوتۆ نیە بۆ رەوانبێژی و گەمەکردن بە وشە و  نیشاندانی توانستە زمانەوانی و تەعبیرییەکانی میدیاکار. بەواتایەکی دیکە لە نووسینی میدیاییدا پانتاییەك نیە بۆ داهێنان بە مانا زمانەوانییەکەی، وەك ئەوەی لە شیعر نووسین و رۆمان و چیرۆك و نۆڤلێ و ژانرە ئەدەبییەکانی دیکەدا دەیبینین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە رووی زمان و ناوەرۆکەوە خاوەن فۆرم و ئسلوبی تایبەتی خۆیەتی.

زمانی میدیا زمانێکی سادە و ئاسانە، وەك ئەو زمانە گشتییە رۆژانەیە وایە کە خەڵکی لە شوێنە گشتیەکان بەکاریدەهێنن، بەڵام لە قاڵبێکی رەوان و ئەدەبیدا، زەخرەفە و وشەی باق و بریقدار و ئاڵۆزی، دوژمنی زمانی میدیان، وەلێ سەربارەی ئەمانە، زمانی میدیا دەچێتە ژێر باڵی کۆمەڵێك پێودانگ و مەرجەوە کە تایبەتمەندیان پێبەخشیوە و ناسنامەی (حرفە)پیشەیان پێداوە، کە لە نووسینێکی ئەدەبی وەك رۆمان یان چیرۆك و شیعر...تاد نابیندرێت.

گرنگی کاری راگەیاندن لە کۆمەڵێك توخمەوە سەرچاوەدەگرێ، پسپۆران بە پێودانگەکانی بڵاوکردنەوە یان وەشاندن ناوی دەبەن، ئەم پێودانگانە وابەستەی راستەخۆیان بە دوو کۆڵەگە سەرەکییەکەی کاری میدیایەوە هەیە ئەوانیش" بابەتیبوون و پرۆفێشناڵیەتە.

هەر بۆیە بەباشم زانی لەم بەشەدا بەر لەوەی راستەوخۆ بچمە سەر باسی تەکنیکی نووسینی هەواڵ و ژانرە رۆژنامەوانییەکانی دیکە، گرنگترین پێودانگە باوەکانی بڵاوکردنەوە بخەمەروو کە بەداخەوە تا نوکە زۆربەی میدیاکار و دەزگا رۆژنامەوانیەکانی کوردستان لە هەردوو قۆناخی کۆکردنەوە و نووسن، و پەخش و وەشاندندا رەچاوی ناکەن.

## پێوەر یان مەرجەکانی بڵاوکردنەوە

هەر رووداو و کردار و زانیارییەك بۆ ئەوەی شایەنی بایەخدانی میدیا و تاوتوێکردنی بێ، پێویستە ئەو پێودانگە سەرەکیانەی تێدا کۆببێتەوە کە رەوایەتی بڵاوکردنەوەی پێدەدەن.نەبوونی مەرجەکانی وەشاندن لەهەر رووداو و دیاردەیەك، مانای نەشیاوییەتی بۆ بڵاوکردنەوە.

پسپۆرانی میدیا و نووسینی رۆژنامەوانی، دوای چەندین دیراسات و لێکۆڵینەوەی مەیدانی و نەزەری، رێککەوتوون لەسەر دیاریکردنی کۆمەڵە پێودانگێك، دەکرێ پێوەرە سەرەکییەکانی بڵاوکردنەوە (جا لە هەر هۆیەکی راگەیاندن بێ) لەمانەی خوارەوە چڕ بکەینەوە:[1].

## یەکەم: نوێبوون (تازەیی)

گەر بمانەوێ هەر زانیاری و رووداوێك شوێنێ تایبەت لەنێو بابەتە رۆژنامەوانییە بڵاوکراوەکان داگیربکات و ببێتە جێی سەرنجی خوێنەران، پێویستە تازە و نوێ بێ، یان زانیاری تازە و هەنوکەیی دەربارەی ئەو رووداو و بابەتانە پێشکەش بکات کە پێشتر بڵاوکراونەتەوە.

بڵاوکردنەوەی رووداوی گەیشتنی مرۆڤ بۆ سەر مانگ، یان دروست کردنی مانگی دەستکرد، یان هەر رووداوێکی دیکە کە هەفتەی رابردوو یان دوێنێ روویداوە نابێتە جێبایەخی خوێنەر و هاندانی بۆ خوێندنەوەی بابەتەکان، بەڵام بڵاوکردنەوەی هەواڵی دۆزینەوەیەکی نوێ کە زانایان لە رێگەی هێنانی بەردێکەوە لەسەر مانگ پێیگەیشتوون، یان هەواڵی مردنی ئەو کەسەی کە یەکەمین مرۆڤ بوو پێی نایە سەر مانگ، بێگومان شەهیەی وەرگر بۆ خوێندنەوە دەکاتەوە، و دەبێتە مایەی گرنگی و سەرنجی.

---

(١) د.أحمد زين الدين: التحرير الصحافي، ط٢، بيروت، دار النهضة العربية،٢٠١٢، ١٤-١٦.

میدیای سەرکەوتوو هێندەی خێرایی تیشك و بروسکە خێرایە، میدیایەکی بروسکەیی ساتەوەخت و چرکە ئامێزە، شەڕ لەگەڵ کات دەکات، هەوڵ دەدات لە ساتەوەختی رووداني کارەسات و رووداو کردارەکاندا، نەك پاش کۆتایی هاتنیان، زانیارییەکان بگوازێتەوە.

بەڵام لە هەموو حاڵەتێکدا ناکرێ وەدەستهێنانی هەواڵی تازە و خێرایی لە گواستنەوەی، لەسەر حیسابی مسداقیەت و بابەتیبوون بێ، رۆژنامەنووس و میدیای سەرکەوتوو هەموو کات رەچاوی ئەو لایەنە دەکات، سومعەی پیشەیی خۆی و دەزگاکەی لەسەرووی هەموو ئیعتیبارێکەوە دادەنێ، رێز لەو متمانەیە دەگرێ کە وەرگر پێیداوە.

تازەیی تەنها هەنوکەیی رووداو و ساتەوەختی روودانی کارەساتەکان نییە، زۆرجار بەدواداچوونی لێزانانە و ورد، تازەیی بە هەواڵ و زانیارییە کۆنەکان دەبەخشێ.مەرج نییە یان مومیکن نییە میدیاکار یان دەزگا ئیعلامییەکان بتوانن رۆژانە هەواڵ و زانیاری نوێ و سەرنجراکێش بگەیەنن، بەڵام ئەوەی مومکینە تاوتوێکردن و خستنەڕووی چارەسەری میدیاییانەی نوێیە بۆ رووداو و هەواڵەکانی رابردوو.

کاتێك سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکیەتی نیشتمانی کوردستان کۆدەبنەوە بۆ تاوتوێکردنی هەموارکردنی رێکەوتنامەی ستراتیژی نێوانیان، یان ئەو کاتەی سەرەك ئۆباما و پوتین کۆدەبنەوە بۆ دانانی نەخشەرێگەیەك لەپێناو کۆتایی هێنان بەشەڕی نێوخۆی سوریا، سەرەتا میدیا هەواڵەکە وەك رووداوێکی نوێ بڵاودەکاتەوە، بەڵام رۆژانی دواتر بەشێوازی تایبەتی خۆی، و لە رێگەی سەرچاوە تایبەتییەکانیەوە هەوڵی ئاشکراکردنی گفتوگۆ نهێنییەکانی نێو کۆبوونەوەکە و ئەنجامە رانەگەیاندراوەکان دەدات، ئینجا رۆشنایی دەخاتە سەر کاریگەری و ئاسەوارەکانیان .

## دووەم: ناباوی (غیر مألوف)

ناباوی مەرجێکی گرنگی وەشاندنی میدیاییە، یەك لەو توخمانەیە خسوسییەت بە نووسینی ڕۆژنامەوانی دەدا، و لە نووسینەکانی دیکەی جیادەکاتەوە.

میدیا بایەخ بە ڕووداوە باو و ئاساییەکان نادات، گەر تۆ هاولاَیەتیەکی ئاسایی بیت و هەموو ڕۆژێك بەیانیان وەك هەر کەسێکی دیکە بچیتە سەر کارەکەت و ئێوارانیش بگەڕێیتەوە ماڵەوە، بێگومان ئەو کردارە ڕۆتینیە و سەدان بارەت هیچ بایەخێکی میدیایی نابێ، بەلاَم گەر هاتوو تۆ مرۆڤێکی کەم ئەندام بیت، ڕۆژانە بەیانیان بە قونەخشکە و لەسەر دەستەکانت بەرە و کارەکەت بچی و ئێوارانیش بەهەمان شێوە بگەڕێیتەوە، بێگومان لەو حاڵەتەیاندا تۆ دەبیتە هەوێنی چیرۆکێکی ڕۆژنامەوانی.

هەر سەبارەت بە مەسەلەی ناباوی، هەمووومان نموونە باوەکەی پیاو و سەگەکە دەزانین، کە زۆر ئاساییە دووەمیان یەکەمیان بگەزێ، بەلاَم پێچەوانەبوونەوەی کردارەکە دەبێتە جێ سەرنجی میدیا.

## سێیەم: کارەساتەکان

بەداخەوە، کارەساتە سروشتییەکان یان ئەوانەی بەهۆی مرۆڤەوە دروست دەبن، ماددەی سەرەکی بابەتە ڕۆژنامەوانییەکانن، چەند ژمارەی قوربانیان و زیانە ماددیەکان گەورەبێ، و قەبارەی کارەساتەکان فراوان و وێرانکەر بێ، هێندە بایەخدان و گرنگی میدیا پێیان زیاتر دەبێ.

ئەم بایەخدانە سەیرەی میدیا بە کارەساتەکان، هەندێجار ئاسەوار و کاردانەوەی نێگەتیڤی لەسەر تاك و کۆمەڵگە دروست کردووە، هەندێك گەیشتوونەتە ئەو قەناعەتەی میدیا بە ئاگاییەوە ڕەهەندی تراژیدی و ترسناك بە کارەساتەکان دەدات، بە ئەنقەست قەبارەی زیانەکان گەورەتر نیشان دەدات، ئەمەش جار جارە فۆبیا و دڵەڕاوکێ لەنێو جەماوەر دروست دەکات.

## چوارەم: رادەی نزیکی روداوەکە لە جەماوەر

میدیا بابەت و زانیاری بۆ جەماوەر بڵاودەکاتەوە، نەك بۆخۆی و کارمەندانی، یان چەند کەسێکی دیاریکراو، لە رووی رۆژنامەوانییەوە بابەتە گرنگەکان ئەوانەن کە زۆر نزیکن لە جەماوەر، و مایەی بایەخ و بەدواداچوونی ئەون.

هەر دەزگا و هۆیەکی راگەیاندن جۆرە جەماوەر و موتابیعێکی هەیە، دەبێ بەدواداچوون و بڵاوکردنەوەی هەواڵ و زانیاری و رووداوەکان یەکانگیربن لەگەڵ ئیهتیمام و حەزو خواستەکانی جەماوەری چاپکراوەکە، یان رادیۆ و تەلەڤزیۆنەکە.

نزکی بابەتە رۆژنامەوانییەکان لە وەرگر شەکل و جۆری جیاوازی هەیە، هەندێکیان مەحکومن بە فاکتەری جوگرافییەوە، هەندێکی دیکە بە لایەنی کەلتووریەوە، بەشێکی دیکەیان بە پاڵنەری پیشەییەوە، جۆرێکی دیکەشیان بە مەودای زەمەنی و فزولّی جەماوەرەوە.

بۆ نموونە، هەواڵی تامپۆنی دوو شەمەندەفەر لە ئەڵمانیا کە زیانێکی گیانی زۆری لێکەوتبێتەوە، بۆ میدیا و وەرگری کوردی بایەخێکی ئەوتۆی نیە، رۆژنامەیەکی کوردی لەوانەیە لە لاپەڕەکانی ناوەوە بەشێوەیەکی کورت و لاوەکی ئاماژەی پێبدات،tv یەکی کوردیش بەهەمان شێوە لە دوابەشی دەنگوباسەکاندا رووماڵی دەکات، بەڵام گەر هاتوو بەشێکی زۆری قوربانیانی رووداوەکە هاوڵاتی کوردی نیشتەجێی ئەڵمانیا بوون، ئەوا رادەی بایەخدانەکە ١٨٠ پلە دەگۆڕێ، لەوانەیە هەندێك رۆژنامەی کوردی بیکەنە مانشێتی سەرەکی، هەندێکی دیکەیان هەر لە لاپەڕەی یەکەم دوای هەواڵی سەرەکی دایبنێن،tv کوردییەکانیش بەهەمان شێوە دەبێ بیکەنە سەردێڕی هەواڵ و دەنگوباسەکانیان[(1)].

---

(١) بەداخەوە هێشتا میدیای کوردی بەگشتی وەك پێویست ئەولەویەت نادات بەو رووداوانەی لەدەرەوەی کوردستان بەسەر جالیەی کوردی دێن، ئەگەر بایەخدانیش هەبێ زیاتر بە هەواڵ و رووداوە سیاسییەکانە،وەك گردبوونەوەیەکی نارەزایی (سیاسی) یان سەردانی بەرپرسێکی هەرێم یان بەرپرسی حزبێکی کوردستانی بۆ دەرەوە و رووماڵکردنی کۆبوونەوە و دیدارەکانی،ئەگەر نا رووماڵکردنی رووداوە کۆمەڵایەتی و عەرەزییەکان

لەو ڕووداوەی سەرەوە ئینتیمای مرۆیی و نەتەوەیی دەخرێتە پێش فاکتەری جوگرافی، با ڕووداوەکە لە دووریی هەزاران کیلۆمەتر لە کوردستانەوە ڕووی دابێ، بەڵام کە بەشێکی زۆری قوربانیەکان کورد بن، بێگومان جێگەی بایەخی تەواوی وەرگری کوردی دەبێ.

هەر بەو پێودانگە، گۆڤارێکی کوردی بایەخدانی بە ژیان و هەواڵ و چالاکییەکانی هونەرمەندێکی خۆماڵی زیاترە وەك بە هونەرمەندێکی عەرەبی و ئەمریکی.لە بوارەکانی کلتوور و وەرزش و زانستیشدا هەمان قاعیدە پەیڕەو دەکرێ.

وەك ئاماژەم پێدا، گرنگی بابەتە ڕۆژنامەوانییەکان لە ڕادەی بایەخی جەماوەرەوە سەرچاوەدەگرن، با ڕووداوێك زۆر گەورە و زەبەلاح بێ، بەڵام کە نەبووە جێبایەخی وەرگر، کەواتە گرنگی ڕۆژنامەوانی نییە، چونکە پرۆسەی پەیوەنیدکردن و پێڕاگەیاندن لەپێناو جەماوەرە و بۆ جەماوەرە.

ئێمەی مرۆڤ بایەخ و گرنگی دانمان بۆ شتەکان پلەدار (متدرج)ە. بۆ نموونە، لە ڕووی زەمەنەوە کە دەزانین ئەمڕۆ چی ڕوویداوە، هەوڵدەدەین بزانین سبەی چی ڕوودەدات، وەدەست خستنی زانیاری دەربارەی ڕووداوەکانی سبەی دەخەینە پێش زانینی ڕووداوەکانی ٦ مانگ یان ساڵێك یان دوو ساڵی داهاتوو.

بەشەوقەوە چاودێری هەواڵی ئەو خۆڵبارینە و زیانەکانی دەکەین کە هەرێمی کوردستانی گرتۆتەوە، بەڵام ئەوەی گرنگترە لامان زانینی کاتی کۆتایی هاتن یان خاوبوونەوەی خۆڵبارینەکەیە.واتا ئێمە بەردەوام پرسیار دەکەین،دوای پرسیار هەر پرسیار دەکەین و زانیاری زیاترمان دەوێ، پرسیار و فوزلی زانینمان وابەستەی ئەو زەمەنەیە کە تێیدا دەژین، بەڵام ئەوەش بەو مانایە نایەت کە حەز ناکەین بزانین ساڵی داهاتوو دیاردەی خۆڵبارین لە کوردستان چڕتر دەبێتەوە، یان بەرەو خاوبوونەوە دەچێ.

---

کە بەسەر ئەو جالیەیە دێن زۆر سنوردارە،وەك هەواڵێکی لاوەکی بڵاودەکرێنەوە نەك وەك هەواڵی مانشێت یان سەردێڕی دەنگوباسەکان.

لەبەرامبەر پلەبەندی زەمەنیی بایەخی هەواڵ بۆ وەرگر، پلەبەندی جوگرافی هەیە، مرۆڤ سەرەتا ئیهتیمامی بۆ کۆڵانەکەی هەیە ئینجا بۆ گەڕەکەکەی، پاشان بۆ شارەکەی، دواتر بۆ وڵاتەکەی، و دواجار بۆ جیهان و ئەو هەسارەیەی ناومان ناوە زەوی و تێیدا دەژین.

تێکستێکی رۆژنامەوانی کە باس لە راکێشانی کارەبای نیشتمانی بۆ گەڕەکە تازە دامەزراوەکەت دەکات، گرنگی و بایەخی لای تۆ زیاترە لەو هەواڵەی باس لە زیادکردنی بەرهەمهێنانی کارەبای نیشتمانی دەکات، و بەهۆیەوە پێدانی کاژێرەکانی کارەبا بە هاوڵاتیان تەنها یەك سعات زیاد بکات.

بەهەمان شێوە هەواڵی بونیادنانی فڕۆکەخانەیەك لە شاری دهۆك بایەخی بۆ دهۆکییەکان زیاترە لەو هەواڵەی زانیاری دەربارەی بونیادنانی فڕۆکەخانەی شاری کەرکوك دەخاتەڕوو.

پیشە یان ئەو کارەی مرۆڤ دەیکات، بەشێکی دیکەی جێبایەخ و گرنگی مرۆڤەکانە، ئێمە نیوەی ژیانمان لە شوێنی کارکردن بەسەردەبەین، بۆیە ئاساییە بایەخمان بۆ ئەو هەواڵانە زۆر بێ کە باس لەکارەکانمان دەکات. لە ژیانی هاوسەری و خێزانیش هەمان بایەخ تێبینی دەکرێت.

فزوڵ و حەزی زانینیمان بۆ ئەوەی لە دەوروبەرمان روودەدات، خاڵێکی دیکەیە لەو خاڵانەی رادەی نزیکی بابەتە میدیاییەکان لە جەماوەر دیاردەکات.مرۆڤ هەر بەسروشت کائینێکی فزوڵیە، هەوڵدەدات زۆرترین زانیاری دەربارەی هاوڕێ و هاوکار و هاوشار و خزم و دۆست و دانیشتوانی شار و وڵاتەکەی بزانێ.هەروەها حەز دەکات لە ژیانی ئاژەڵ و زیندەوەرەکانیش وردبێتەوە و تێبگات بە چ سوڕ و شێوازێك دەژین، و سایکۆ و سوڕی ژیانیان چۆنە.هەروەها بزانێ هاوڕەگەزەکانی لە میسر و ئەمریکا و ئەوروپا و چین....تاد، کلتوور و عادات و شێوەی ژیان و جل و بەرگ و بیرکردنەوە و ناوماڵ و ئۆتۆمبیلیان چۆنە.هاوکات ئارەزووی زانینی هەموو داهێنان و شتێکی نوێی هەیە، لە ئۆتۆمبیل و کۆمبیوتەر و مۆبیل و کەلوپەلی ناوماڵ و ئەلیکترۆنیات.

میدیای نزیك لەجەماوەر و پرۆفیشناڵ هیچ کاتێك گەیاندنی زانیاری دەربارەی ئەو لایەنانەی ژیان فەرامۆش ناکات، هەوڵدەدات لەپاڵ وەزیفەی ئاڕاستەکردن و پێڕاگەیاندن، حەز و ئارەزوو و داواکارییەکانی جەماوەرەکەی تێر بکات.

## پێنجەم: ناو بانگی و ناوداری

میدیا بەگشتی بایەخ بە کەسایەتییە ناودارەکان دەدات، زوومی دەخاتە سەر ژیان و بەرهەم و چالاکیەکانیان، ژیانی ئەستێرەکانی بواری نواندن و سینەما و سیاسەت و کۆمەڵایەتی و ئابووری، ماددەیەکی چەوری دەزگاکانی ڕاگەیاندنن.

هاوسەرگیری کەسێکی ئاسایی نابێتە مایەی بایەخی میدیا چونکە لە ئەساسدا جێبایەخی زۆرینەی خەڵك نیە، بەڵام کاتێك هونەرمەندێکی ناودار زەواج دەکات، جەماوەر ئارەزوو دەکات بزانێ هاوسەرەکەی کێیە، شێوەی چۆنە، تەمەنی چەندە، و خەڵکی کوێیە...تاد .

خەڵکی هەر بەسروشت حەز لە زانینی ژیانی تایبەتی کەسایەتییە گشتییەکان دەکەن و بەدوایدا دەگەڕێن.

لە میدیای کوردی هێشتا ئەو بایەخدانە لە قۆناخی سەرەتاییدایە، نەك لەبەر ئەوەی کۆمەڵگەی کوردی حەز بەزانینی هەواڵی کەسایەتییە گشتییەکان ناکات، بەڵکە لەبەر ئەوەی میدیا لەرووی کۆمەڵایەتییەوە هێشتا جورئەتی بڵاوکردنەوەی هەواڵی لەوجۆرەی نییە، یان ئەو جۆرە بایەخە نەبۆتە ریتم و مۆدێکی باو، یان لەوانەیە لەبەر ئەوەبێ هەندێك لە بەرپرسانی دەزگا رۆژنامەوانییەکان ئەم جۆرە بەدواداچوونە بە وەزیفەی میدیا نەزانن، و بە کەمکردنەوە لە هەیبەت و پێگەی میدیای حیساب بکەن.

میدیای عەرەبی، بەتایبەت لبنانی و میسری، گۆشە و لاپەڕەی تایبەتیان بۆ هەواڵی تایبەتی کەسایەتییە گشتییەکان تەرخان کردووە، لە ئەوروپا و ئەمریکاش، میدیای هونەری و کۆمەڵایەتی هەمان بایەخدانی هەیە.بەڵام بڵاوکردنەوەی وێنە و هەواڵی بۆنە تایبەتییەکانی کەسانی ئاسایی بەرامبەر بڕە پارەیەك دەبێ کە وەك جۆرێك لە رێکلام مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت.

له ڕۆژنامەگەری کوردی جار جارە هەواڵی لەوجۆرە دەبیندرێت، بەتایبەت لەو حاڵەتانەی کەسایەتییەکە ڕازی بێ لەسەر بڵاوکردنەوەی، هەروەها بە کەمیش هەواڵی زەواج یان کۆچی دوایی کەسێکی ئاسایی بڵاودەکرێتەوە، لەمەدا پەیوەندی تایبەتی ئەو کەسە لەگەڵ یەکێك لە کارمەندە دەست ڕۆیشتووەکانی دەزگاکە ڕۆڵ دەبینێ، بەمانایەکی دیکە بڵاوکردنەوەی هەواڵ و وێنەی کەسانی ئاسایی لە ڕۆژنامەگەری کوردی زیاتر مەحکومی پەیوەندیی کەسییە، نەك ڕێکلام و پارە وەرگرتن.

## شەشەم: تەرفیە و خۆشی

ئەم پێودانگە پێودانگێکی نوێیە بە بەراورد بەوانی پێشوو، میدیای هاوچەرخ تەرفیە و گاڵتە وگەپ بە وەزیفەی سەرەکی دەزگا ڕۆژنامەوانییەکان هەژمار دەکات.

لەراستیشدا بایەخدانی میدیا بە تەرفیە و خۆشی لە دونیای ئەمڕۆدا بایەخدانێکە لە جێگەی خۆیەتی، چونکە سەختبوونی ژیان، و زۆری کێشەکانی کۆمەڵگە، و ئیشکی هەواڵ و ڕووداوە سیاسییە نێوخۆیی و جیهانییەکان، بەردەوام هۆکاری گرژبوونی ناخی مرۆڤ و دروستبوونی پاڵەپەستۆی دەروونی و دڵە ڕاوکێن، لێرەوە بابەتە تەرفیهییەکان خۆشی دەخەنە دەروونی جەماوەرەوە، کەمێکیش ئەو پاڵەپەستۆ و گرژیە خاودەکەنەوە کە ناخی داگیر دەکات.

شێوازی نووسینی گاڵتەجاری بەتایبەت لە وتارە ڕۆژنامەوانییەکان، و هونەری کاریکاتێر، هەمدیس دەکرێ حیسابی تەرفیهیان بۆ بکرێت کە میدیای هاوچەرخ بایەخی تایبەتیان پێدەدات، بەو پێیەی حەز و خواستی زۆرینەی مرۆڤی ئەم ڕۆژگارەیە.

## حەوتەم: بەرژەوەندی گشتی

بەرژەوەندی گشتی نەك بەو مانا لاستیكییەی  كە دەخزێندرێتە هەندێك لە یاساكانی رۆژنامەگەری و رادەربڕین، بەڵكە بە مانای ئەوەی گرنگی تێكستە رۆژنامەوانییەكان زیاتر دەبێ چەند رادەی وابەستەیی بە بەرژەوەندی گشتی خەڵكەوە زیاتر بوو. بە واتایەكی دیكە دەتوانین بڵێین" یەكەی پێوانەكردنی گرنگی میدیا بەرزتر دەبێ لەگەڵ بەرزبوونەوەی ژمارەی  ئەوانەی بایەخ بە زانیاری و بابەتە بڵاوكراوەكە دەدەن.

واتا لەبەردەم پێوانەیەكی هاوكێشەیی هاوتەریب و هەڵكشاوداین، گرنگی بابەتە بڵاوكراوەكە بۆ زۆرترین خەڵك، یان بایەخی زۆرینەی خەڵك بە بابەتەكە، یەكسانە بە گرنگی چیرۆكە رۆژنامەوانیەكە.

بۆ نموونە، كە میدیا باس لە  یاسای هەڵبژاردن و شێوازی هەڵبژاردنی سەرۆك، یان ئیقراركردنی بودجەی گشتی دەوڵەت، یان نرخ و باج، یان گۆڕینی پرۆگرامی خوێندن دەكات، حەتمەن لەو حاڵەتانەدا گرنگی بابەتە رۆژنامەوانییەكە زۆر زیاترە لەو بابەتەی تیشك دەخاتە سەر جێبەجێكردنی پرۆژەیەكی خزمەتگوزاری سنووردار لە گەڕەكێكی شاری كۆیە یان دهۆك، چونكە یەكەمیان جێبایەخی رای گشتییە، بەو پێیەی كۆنتاكتی راستەوخۆی بە ژیانی زۆرینەی هاوڵاتیانەوە هەیە، بەڵام دووەمیان بۆ ژمارەیەكی دیاریكراوی خەڵك گرنگە، لە ناوچەیەكی جوگرافی سنوردار.

نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێ جۆری میدیاش رۆڵ دەبینێ لە دیاریكردنی مانای بەرژەوەندی گشتی، بێگومان لێرە مەبەستم لە جۆری میدیا، ئەو دابەشكردنە تابەتمەندەیە كە رۆژنامەگەری بەسەر میدیای سیاسی و كۆمەڵایەتی و ئابووری و وەرزشی...تاد، دابەش دەكات.لێرەدا بەرژەوەندی گشتی لە میدیایەكەوە بۆ یەكێكی دیكە جیاوازە، لە رۆژنامەیەك یان tv یێكی تایبەت بە وەرزش، بەرژەوەندی گشتی بریتی دەبێ لە خواست و حەزەكانی زۆرینەی هەوادارانی چالاكییە وەرزشییەكان، لەوانەیە گواستنەوەی راستەوخۆی یاری نێوان یانەی ریال

مەدرید و بەرشەلۆنە، یان بڵاوکردنەوەی بڕیارەکانی یەکیەتی تۆپی پێ دەربارەی شێوازی بەڕێوەچوونی خولی ساڵانە، بۆ ئەو جۆرە جەماوەرە زۆر گرنگ و بایەخدارتر بێ لە هەواڵی رۆژنامەیەکی گشتی کە باس لە دوایین بڕیارەکانی حکومەت دەکات.

## هەشتەم: خزمەتگوزاری

ئەم پێودانگەش پێودانگێکی تازەیە، بەڵام لە میدیای نوێدا حیسابی تایبەتی بۆ دەکرێت، لەبەر ئەوەی وەرگر لە پاڵ وەدەستهێنانی زانیاری و هەواڵ دەربارەی رۆژەڤەکانی رۆژ، جا سیاسی بن یان کۆمەڵایەتی و کلتووری و ئابووری، داوای خزمەتگوزاری کڕینی مۆبیل یان ئۆتۆمبیلی لێدەکات، دەیەوێ بزانێ نرخ و مواسەفاتیان چییە و چەندە، هەروەها بەئەرکی میدیای دەزانێ هاریکاری بکات لە هەڵبژاردنی شوێنێك بەنرخێکی گونجاو بۆ بەسەربردنی پشوی هاوینە، یان گەشتێکی تەرفیهی لە دەرەوەی وڵات، یان چۆن بتوانێ بەشێك لەو داهاتەی دەکەوێتە دەستی هەمووی خەرج نەکا و هەندێکی پاشەکەوت بکات.

هەروەها ئەرکی میدیایە خزمەتگوزاری پێشکەش بە خاوەن پێداویستییە تایبەتەکان بکات، لە دەنگوباس و بەرنامەکان کەسانی شارەزا بەزمان و تێگەیشتنی ئەوان دابنێت بۆ گەیاندنی ناوەڕۆکی چیرۆکە رۆژنامەوانییەکان. رێنمایی خەڵك بکات بۆ رەچاوکردنی بارودۆخی جەستەییان.

هەندێك رۆژنامە و tv خزمەتێکی مەزن پێشکەش دەکەن کاتێك تیشك دەخەنە سەر موعاناتی هەژاران و نەداران، و ئەو نەخۆشانەی بەهۆی کەمدەرامەتییەوە لە چارەسەرکردن بێبەشن، هاندانی خەڵکی بۆ یارمەتیدان و بەدەنگەوە هاتنی خەم و ئازارەکانی ئەمانە، یەك لە وەزیفەکانی میدیای هاوچەرخە.

## کۆکردنەوەی هەموو پێوەرەکان لەیەك بابەتدا!!

پێودانگەکانی بڵاوکردنەوە تێکهەڵکێش و تێکەڵاوی یەگدین، هەندێکیان تەنها تاڵە موویەك لێکیان جیادەکاتەوە، رۆژنامەنووسی بە سەلیقە بە هۆی ئەزموونی کەڵەکەبووی، ئەو پێودانگانەی وا هەزم و هەزبەرکردووە، هەمووجار پێویستی بەوە نیە زانیارییەکان بخاتە ژێر هاوێنەی پێودانگەکان، ئەو یەکسەر دەزانێ چی جێبایەخی جەماوەرە، و هاوکۆکە دەگەڵ مەرجەکانی بڵاوکردنەوە.

لێرەدا خوێنەر حەقی خۆیەتی پرسیاری ئەوە بکات، ئایا مەرجە هەموو ئەو پێودانگانە لە تێکستێکدا کۆببنەوە؟؟

تێکستی رۆژنامەوانی باش و ئامانجدار بە مانا پیشەییەکەی ئەو تێکستەیە زیاتر لە پێودانگێك لەخۆیدا کۆدەکاتەوە.ئەم وەڵامە زیاتر بۆ ئەو میدیا پرۆفێشناڵە گونجاوە، کە بەپێی یاسای بازاڕ، لە کەشوهەوایەکی لیبراڵی ئازاددا کاردەکات.

بەڵام لە هەمان کاتدا وەڵامەکە مانای ئەوە نیە ئەو هەواڵ و بابەتانەی کەمترین پێودانگ لەخۆ دەگرن، بە بابەتی رۆژنامەوانی داناندرێن، چونکە هەندێك دەزگا ئەوەندەی وابەستەی پێودانگی ئایدیۆلۆژی و خاوەندارێتی و وەزیفی و میزاجی سەرنووسەر یان کەسی یەکەمی دەزگاکەیە، ئەوەندە پێودانگەکانی بڵاوکردنەوەی لا گرنگ نیە.ئەوان کاری رۆژنامەوانی دەکەن بەڵام بەشێوازە کلاسیکییەکە، لەوانەیە زمانحاڵی پارتێکی سیاسی بن، یان کەسایەتی و سەرمایەدارێك تەمویلیان بکات، یان سەرنووسەرەکە خۆی خاوەنی دەزگاکە بێ، و لە رووی تەمویلەوە کێشـــەیان نەبێ[(١)] .

ئیشکالیەتی هەرە دیاری ئەو میدیایە لەوەدا چڕدەبێتەوە نابێتە جێبایەخی زۆرینەی خەڵك، بەهۆی رەچاونەکردنی پێودانگەکان لە دیاریکردنی بابەتە بڵاوکراوەکان، کە فاکتەری سەرەکی بازاڕ و پڕفرۆشی هەر دەزگایەکی رۆژنامەوانین

(١) جاك موريكان، الكتابة الصحافية،ت: أنسام محمد،ط٩، بيروت، دار البحار،١٢٣،٢٠١١.

بەجیاوازی جۆرەکانیەوە، ئەمە سەرباری دروستبوونی ئیشکالیەتی بێلایەنی و ئازادنەبوون لە بڵاوکردنەوەی هەموو جۆرە زانیاری و هەواڵێك.

## نووسینی رۆژنامەوانی سەرکەوتوو

نووسینی رۆژنامەوانی لە سادەترین مانایدا بریتیە، لە پێشکەش کردنی گرنگترین زانیاری لە باشترین دارشتن (صیاغە)دا،لە سیاقێکی بابەتیانەی سەرنجراکێش.

نووسینی میدیایی وەك هەر تێستێکی دیکە، لە شەکل و ناوەرۆك پێك دێت، واتە لە مانا و هەیکەل، کە دەبێ هاوسەنگی لە نێوانیاندا هەبێ، بێ هەبوونی هاوسەنگی، خەلەل و کەموکورتی دەکەوێتە ناوەرۆکی نووسینەکە.

کەواتە دەکرێ بڵێین" تێکستی رۆژنامەوانی سەرکەوتوو ئەو نووسینەیە کە:

١/هاوسەنگی لە نێوان ناوەرۆك و هەیکەلدا دەکات، واتا زانیارییەکان (کە ناوەرۆکن) بەپێی بنەما باوەکانی نووسینی میدیایی دادەرێژرێن، جا تێکستەکە هەواڵ بێ یان ریپۆرتاژ یان وتار...تاد.

٢/بە شێوازێکی کورت و پوخت و روون و رەوان (مفهوم) دادەرێژرێ، بەکوردی و بە پوختی، درێژدادری و دووبارەکردنەوە، دوژمنی نووسینی میدیاییە.

٣/ئسلوبێکی راستەوخۆی سەرانج راکێشی هەیە، لە چوارچێوەی ئەو زمانەی بە زمانی رۆژنامەگەری ناودەبرێت.

٤/زۆرترین زانیاری، لە کەمترین وشە و دێردا بە وەرگر دەدات.

ئەم خاڵانە لەرووی تێورییەوە، کۆڵەگە سەرەکییەکانی تێکستێکی رۆژنامەوانی سەرکەوتوون، بەڵام لەسەر کاغەز چۆن دەتوانین نووسینێك بخولقێنین کە پێناسەی (نووسینی رۆژنامەوانی)بە باڵادا ببردرێ، و تەواو هاوئاهەنگی بنەما زانستییەکانی ئەو شێوە نووسینە بێ؟؟

سەرەتا وەك چۆن دەتەوێت سەرجەم زانیارییەکان لە تێکستێك کۆبکەوە، با درێژیش بێت کێشە نیە، ئینجا دێر دێر پێداچوونەوەی بۆ بکە، ئەو وشە و دەستەواژانە فرێ بدە کە بوون و نەبوونیان وەك یەك وایە، و هیچ ئیزافە و

مەعریفەیەك بە وەرگر نادەن، دوای ئەوە هەوڵی گۆڕینی هەندێك وشە بە وشەی گونجاوتر بدە، پاشان تێبینی ئەوە بکە تاچەند خاڵبەندیت بۆ نووسینەکەت داناوە، واتە خاڵ و فاریزە و کەوانە و ...تاد لە نێوان وشە و رستەکان، لە شوێنی خۆیان داندراون، چونکە"خاڵبەندی یارمەتی خوێنەر دەدات بە ئاسانی لە مانا و مەبەستی نووسەر بگات، و نووسینەکەی لە هەموو شێوە ناڕوونی و دژواریەك دوور دەکاتەوە"[(١)].

ئەم پێداچوونەوە و خاڵبەندییە، تێکستەکەت لە وشەی زیاد و دێرژدادڕی دوور دەکاتەوە، یارمەتیت دەدات زۆرترین زانیاری، بە کەمترین وشە، لەسیاغەیەکی سادەو رەوان بگەیەنیە وەرگر.

- **ئەم نموونەی خوارەوە، یارمەتیت دەدات چۆن نووسینەکەت کورت و پوخت بنووسی:**

*نووسینەکە پێش رێکخستن*

*-هەڵگرێکی بڕوانامەی زانکۆ، کە بەکالۆریۆسی هەیە لە یاسا، دەڵێت:"یاسا هەر کەسێك سزا دەدات هەر شتێکی لەدەست بگیرێت کە ئابڕووی خەڵکی دیکە ببات،بەڵام تەکنەلۆژیای نوێ وەك ئینتەرنێت مۆبایل و کۆمبیوتەر وایکردووە سزادان ئەستەم بێ،چونکە پەنجە داگرتنێك بە کیبۆرد بەسە بۆ رەشکردنەوەی ئاسەواری تاوانەکە"*

*نووسینەکە دوای رێکخستن*

*-رێپێدراوێکی بواری ماف دەڵێت:"یاسا سزای هەڵگرانی کەلوپەلی ئابڕوبەر دەدات، بەڵام تەکنەلۆژیا و تۆڕی ئینتەرنێت وایکردووە سزادانی ئەو جۆرە*

(١) موسى علي الشهاب، اتجاهات معاصرة في كتابة المقال الصحفي، ط١، دار أسامة، الأردن-عمان، ٢٠١٢م، ١٢٤.

*کەسانە تاڕادەیەك ئەستەم بێ، چونکە تەنها پلێك بەسەر کیبۆردەوە بەسە بۆ بزرکردنی تەواوی ئاسەواری تاوانەکە،لەچاو نوقانێکدا."*

خاڵێکی دیکەی گرنگ کە پێویستە لە نووسینی رۆژنامەنووسی تێبینی بکەین و تایبەتمەندی بەو نووسینە دەدات، زمانە، وەك لەسەرەتای ئەم بەشە ئاماژەمان پێدا، زمانی میدیا زمانێکی سادە و تایبەتە، لە ناوەڕاستی زمانی ئەدەبی و زانستی دەوەستێت.

کە دەڵێین سادەیی لە زمانی میدیا، مەبەستمان زمانی قسەکردنی رۆژانە و بازاڕ نیە، بەڵکە ئەو زمانەیە کە هەموو خەڵك تێیدەگات، و بەدەر نییە لە رێسا و یاسا زمانەوانییەکان. سادەیی بۆ ئەوەیە هەموو خەڵك تێبگات، بە جیاوازی پاشخانی زانستی و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتییان، چونکە میدیا موخاتەبەی رای گشتی و تەواوی جەماوەر دەکات، کە هەر تاکێکی لە ئاست و پلەیەکی خوێندەواری و رۆشنبیری دایە.

رۆژنامە و کتێب هەردووکیان کەرەستەی پەیوەندیکرنن بە جەماوەر بەڵام لە رووی زمانەوە جیاوازییان هەیە، زمانی رۆژنامە وەك زمانی نووسینی کتێب نییە، کە ئاڕاستەی نوخبەیەکی دیاریکراو دەکرێت، و کێشەی لە تێگەیشتنی داڕشتن و دەستەواژەکاند نیە[1].

بەڵام هەر لەنێو هەناوی زمانی میدیاشدا پلە بەندی و جیاوازی هەیە، واتە ئەو زمانە تاسەر بە یەك ئاواز و ریتم ناڕوات، زمانی رۆژنامە جیاوازە لە هەفتەنامە و زمانی گۆڤارەکان، زمانی گۆڤارێکی هەفتانەش جیاوازە لە زمانی گۆڤارێکی مانگانە، مانگانەش زمانەکەی وەك گۆڤارێکی تایبەتمەند یان میدیای تایبەتمەند نییە، بەهەمان شێوە جیاوازی لە نێوان زمانی میدیای نووسرا و بیسترا و بینراو هەیە، واتە جۆری میدیا و تایبەتمەندی و جۆری وەرگرەکەی، تەحەکوم دەکەن لە دیاریکردنی ئەو زمانەی زانیاری و رووداوەکانی پێدەنووسرێتەوە.

---

(١) کتێبێکم بە ناوی: المقالة الصحفية، ط١، بيروت، دار المنهل اللبناني، ٢٠١٣، ١٩٨.

له گۆڤارێکی تایبەتمەند بە یاسا و مافپەروەران، یان گۆڤاری (ڕۆژنامەنووس)ی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان، هەمان ئەو زمانە بەکارناهێندرێت کە ڕۆژنامەی هاوڵاتی یان خەبات و کوردستانی نوێ بەکاری دێنن، هەروەها دەستەواژە و وشەکانیشیان جیاوازن لە یەگدی.

لە ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە، هەروەها لە رادیۆ و تەلەڤزیۆنیش دەبێ نووسەر (محرر)ی هەواڵ هەردەم ئەوە لەخۆی بپرسێ ئایا ئەوەی دەینووسێت مەفهومە، ئایا هەموو خەڵك تێی دەگات؟؟

هەندێك دەستەواژە و کردار (فعل) هەن بەردەوام لە تێکستە ڕۆژنامەوانییەکان دووبارە دەبنەوە، وەك، (گوتی، دەڵێت، زیاتر گوتی، بەردەوام بوو لە قسەکانی، جەختی لەسەر ئەوە کرد، رایگەیاند، لەدرێژەی قسەکانیدا، ئاماژەی بۆ ئەوە کرد، رای وابوو، هاوکات، بەڵام، لەهەمان چوارچێوەدا، لەلایەکی دیکەوە، جێگەی ئاماژە بۆکردنە، وادیارە، بێگومان...تاد) بەکار هێنانی هەریەك لەو دەستەواژە و کردارانە دەبێ  لە کات و شوێنی خۆی بێ، دەنا سیاغەی نووسینەکە لەنگ دەکات، هەروەها لە هەندێك حاڵەتیشدا لەوانەیە سیفەتی بێلایەنی لە ڕۆژنامەنووسەکە بسەنێتەوە.

بۆ نموونە پێویستە جیاکاری لە نێوان هەردوو کرداری (ئاماژەی پێدا) لەگەڵ (رای وابوو) بکەی و بزانی کەی و بۆچی بەکار دێن، یەکەمیان زیاتر ئەو ئینتیباعە دەداتە  وەرگر کە شتە ئاماژە بۆ کراوەکە  مەقبول و پەسندە لای ڕۆژنامەنووسەکە یان دەزگاکەی، بەڵام دووەمیان ئاماژەیە بۆ هەبوونی قسە، یان بۆچوونی شەخسی کەسێك.

*لەو تێکستەدا:*

*لەو وڵاتە سەرۆك راستەوخۆ لەلایەن خەڵکەوە هەڵدەبژێردرێ، بەڵام خەڵك بایەخێکی ئەوتۆ بەو بابەتە نادەن، بۆیە دوای هەڵبژاردنەکان سەرۆك بە ئارەزووی خۆی چی بیەوێت دەیکات.*

*دەبێ کرداری (ئاماژەی بەوەدا) لەگەڵ بیرۆکەی هەڵبژاردنی سەرۆك لەلایەن خەڵکەوە،بەکاربێنی، و کرداری (رای وابوو) لەگەڵ رستەی خەڵك بایەخ بەو بابەتە نادەن، دابنێی.*

*پێویستە سەرجەم راو بۆچوونەکان لە نێو دوو کەوانەی بچووك دابنێی کە هێمایە بۆ ئیقتیباس و وەرگرتن:*
*"بەڵام خەڵك **بایەخ بەو بابەتە نادەن**" .*

## بێلایەنی لە نووسینی میدیایدا

بێلایەنی، کۆڵەگەی بنەڕەتی دەقە رۆژنامەوانییەکانە، هەواڵ و سەرجەم ژانرە رۆژنامەوانییەکانی دیکە، وتاری لێدەرچێ، دەبێ خالی بن لەهەر ئینتیباع و راو بۆچوونێکی کەسیی.

هاوتەریب لەگەڵ ئەم قاعیدە رۆژنامەوانییە، هەندێك پسپۆر پێیان وایە، ئەم مەسەلەیە مەسەلەیەکی رێژەییە، یەك لەوانە پسپۆری میدیایی لبنانی ناودار ئەحمەد زەینەدین لە کتێبەکەی (التحریر الصحافی)، دەڵێت:"بێگومان و بەرەهاییەوە دەڵێم“ هیچ دەقێکی رۆژنامەوانی سەد دەر سەد بێلایەن نییە."

بێلایەنی واتە رادەرنەبڕین و قسەنەکردن بە سیغەی کەسی، و سەرپشککردنی وەرگر لە تێگەیشتنی بۆ ناوەڕۆکی مەسژە رۆژنامەوانییەکە. واتە نابێ بە ناڕاستەوخۆش میدیاکار هێمایەك یان بۆچوونێك بۆ وەرگر بنێرێت کار لەسەر تێگەیشتن و شرۆڤەی بکات.
قسەکردن بە سیغەی کەسی دەقە رۆژنامەوانییەکان لە سیفەتی بێلایەنی بەتاڵ دەکات، دەبێ میدیاکار بەدیقەتەوە مامەڵە لەگەڵ ئەو بابەتە بکات.

*- هەرگیز مەنووسە: کە چوومە ئەو شوێنە، یەکەم شت سەرنجی راکێشام دیکۆری....*

*- بەڵکە بنووسە: کە دەچیتە ئەو شوێنە، یەکەم شت سەرنجت رابکێشێ دیکۆری....*

هەر دەقێکی رۆژنامەوانی، بەجیاوازی ژانرەکانییەوە، دوو جۆرە زانیاری لەخۆدیدا کۆدەکاتەوە:
**یەکەمیان:** بۆنی هیچ هەڵوێست و بۆچوونێکی لێناکرێت، لەوانەیە راست بێ لەوانەشە هەڵە، وەرگر دەتوانێ قبوڵی بکات یان رەتی بکاتەوە، نووسەر دەتوانێ بێ ئاماژەدان بە سەرچاوەکەی بەکاری بێنێت، و نەیخاتە نێو دوو کەوانەوە، بەکارهێنانی، رۆژنامەنووس و دەزگاکەی ناخاتە ژێر باری هیچ بەرپرسیارییەتیەکەوە. وەك (ساڵ چوار وەرزە، زەوی بەدەوری رۆژدا دەسوڕێتەوە، شێوەی زەوی هێلکەییە، کوردستان وڵاتێکی شاخاوییە، لبنان دەکەوێتە سەر دەریای سپی ناوەڕاست، تورکیا و ئێران و سوریا و سعودیە و ئەردەن و کوێت، هاوسنووری عێراقن. .تاد.)
**دووەمیان:** ئەمەیان بە پێچەوانەی یەکەمە، دەبێ رۆژنامەنووس ناوی سەرچاوەی زانیارییەکە بێنێت، وەك (لە کوردستان ٣٠٠٠ رۆژنامەنووس هەیە،

هۆکاری سەرەکی پیسبوونی ژینگە وڵاتە زلهێزەکانن، هەڵبژاردنی پەرلەمانی هەرێم لە مانگی سێپتێمبەر ئەنجام دەدرێت، ئازادی رادەربڕین لە کوردستان نیە...تاد)، هەموو ئەمانە دەبێ لە یەکێك وەرگیرابن، یان ئاماژە بۆ سەرچاوەکەیان بکرێت.واتە پێویستە وەرگر بزانێ رۆژنامەنووسەکە ئەو زانیارییانەی لە کوێ هێناوە[1].

لە حاڵەتێکدا گەر هاتوو سەرچاوەی هەواڵەکە کەسێك بوو حەزی نەکرد ناوی بڵاوبکرێتەوە، پێویستە هێما بۆ ئەوە بکرێت، سەرچاوەکە حەزی نەکرد ناوی بهێندرێت.بەڵام ئەو جۆرە هەواڵانە میسداقیەتیان هەم لەرووی پیشەیی و هەم لەرووی جەماوەرییە لاوازە، و هەواڵی خوازراو نین.

لەبەر رۆشنایی هەموو ئەوانە دەتوانم بڵێم: باشترین بابەتە رۆژنامەوانییەکان ئەوانەن کە زۆرترین پێودانگەکانی بڵاوکردنەوە لەخۆیان کۆدەکەنەوە . گرنگی هەر بابەتێکیش گرێدراوی رادەی بایەخپێدانی جەماوەر بەو بابەتە، و چەند بایەخی جەماوەری زیاتر بێ، ئەوەندە گرنگییەکەی زیاتر دەبێ.دەقی رۆژنامەنووسی سەرکەوتووش ئەو دەقەیە بە زمانێکی سادەی سەرنجراکێش، بەشێوازێکی بێلایەنانە، دوور لە درێژدادڕی و ئاڵۆزی دەنووسرێت.

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ئەحمەد زەینەدین، ١٩.

# بەشی دووەم

## هەواڵی رۆژنامەوانی

تەکنیکی نووسینی هەواڵ

سەرچاوەکانی هەواڵ

گەڕان بەدوای هەواڵدا

هەواڵی سادە

هەواڵی تێکەڵ، مورەکەب

هەواڵی نێوخۆیی

هەواڵی مانشێت

هەواڵ لە هەفتەنامە و گۆڤارەکاندا

راپۆرتە هەواڵ

رووماڵکردنی هەواڵ

رۆژ ژمێری رۆژنامەنووس

رووداوێك روودەدات، و هاوئاوازە لەگەڵ پێوەرەکانی بڵاوکردنەوە، میدیا بایەخی پێدەدات، ئەو رووداوە بەپێی جۆر و گرنگییەکەی، یان دەبێتە هەواڵ یان هەر ژانرێکی دیکەی رۆژنامەوانی.

هەواڵ بڕبڕەی پشتی رۆژنامەگەری و شادەماریەتی، هەر لەوەوە ژانرەکانی دیکە سەرچاوە دەگرن. هەواڵ هەر هەواڵە جا مەکتەبی(نووسینگەیی) بێ یان مەیدانی، هەندێ جار هەواڵ خۆی دێتە نووسینگەی دەزگاکە، رۆژنامەنووس تەنها سیاغەیەکی رۆژنامەوانی بۆ دەکات، جاری واش هەیە دەبێ دەزگاکە خۆی بەدوایدا رابکات و بچێتە شوێنی رووداوەکە بۆ گواستنەوەی وردەکارییەکانی.

لە ئێستادا هەواڵ لە رۆژنامەگەری چاپکراو لە هەر ژانرێکی دیکە لە قەیران دایە، و داهاتوویەکی تراژیدی چاوەڕێی دەکات، پاشەکشەکردنی هەواڵی رۆژنامەکان لەژێر کاریگەری پێشکەوتنی خێرای تەکنەلۆژیای گەیاندنە، کە رۆژ لەدوای رۆژ خێراتر دەبێ، رادیۆ و tvو میدیای ئەلیکترۆنی و سۆشیال میدیا، بڵاوکردنەوەی هەواڵیان لە رۆژنامەکان ئیحراج کردووە، رۆژانە بەهۆی خێرایییان لە بڵاوکردنەوە، شتێکی ئەوتۆ بۆ رۆژنامەکان جێناهێڵن ناوی هەواڵ بێ.بەبڕوای من لە داهاتوویەکی نزیکدا رۆژنامەکان بەتەواوی دەسبەرداری هەواڵ دەبن، دەبێ زیاتر قورسایی خۆیان بخەنە سەر رەهەندەکانی دوای هەواڵ، لە رێگەی راپۆرتە هەواڵ و شرۆڤەکردن و ریپۆرتاژ و وتارەوە.

## تەکنیکی نووسینی هەواڵ

هەواڵی رۆژنامەوانی لە سادەترین مانایدا بریتیە لەو دەقەی وەڵامی پێنج پرسیاری سەرەکی دەداتەوە، کێ؟(بەشداربووی رووداوەکە جا بکەر بێ یان تەواوکەر)، کەی؟(کاتی روودانی رووداوەکە)، چی؟(کرۆکی رووداوەکە و ناوەڕۆکەکەی)، چۆن؟(چۆن رووداوەکە روویداوە)، لە کوێ؟(شوێنی روودانی).

هەر دەقێك بەدەر لەقەبارەکەی، جگە لە وەڵامی ئەم پێنج پرسیارە، هیچ وەڵام و وردەکارییەکی دیکی تێدا نەبوو ، پێی دەگووترێت هەواڵی سادە.

وەزیفەی داڕێژەر یان نووسەری هەواڵ، وەڵامدانەوەی ئەو پێنج پرسیارە سەرەکییەیە، ئینجا رێکخستنیان بەپێی گرنگیان، لە دەقێکدا کە کردار(فعل) تێیدا بە دەمی رابردوو بەکاردەهێندرێت.

باشترین رێگەی نووسینی هەواڵ شێوازی هەرەمی سەرەوژێر کراوە(الهرم المقلوب)ە،"ئەم جۆرە بەباشترین شێواز بۆ باسکردنی رووداوەکان بەهەموو جۆرەکانییەوە لە نێوان شێوازەکانی تردا دادەنرێت، بەوەش جیادەکرێتەوە بەوەی ورد و درشتی هەواڵ راستەوخۆ بۆ خوێنەر دەگوازێتەوە، هەر لە بڕگەی یەکەمیشەوە خوێنەر ئەمە پەسند دەکات، چونکە ئارەزووی زانینی کورتەیەك دەکات."[1] .

لەم شێوازەدا گرنگترین زانیاری لە سەرەتای هەواڵەکە دەنووسرێ، لێرەدا گرنگی پەیوەندی بە پێوەرەکانی بڵاوکردنەوە هەیە، کام وەڵام زۆرترین پێوەری تێدابوو، بەرز دەبێتەوە بۆ دەسپێکی هەواڵەکە.

---

([1])حەبیب کەرکوکی: هونەری رۆژنامەنووسی، و:سەمیرە ئەحمەد، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی- چاپخانەی خانی- دهۆك، ٢٠٠٨، ٣٨ .

* ***هەموو کات گرنگترین زانیاری دەسنیشان بکە و هەواڵەکە بەو دەستپێبکە:***

*- هەندێ جار وەڵامی پرسیاری(چی و چۆن)گرنگ و لە پێشترە(دوو کەس گیانیان لەدەست داو سێی دیکەش بریندار بوون بەهۆی ئەو رووداوەی دوێنێ لە رێگەی سەرەکی هەولێر - دهۆك روویدا)*

*- هەندێ جاری دیکەش وەڵامی پرسیاری(کێ) گرنگتر و لەپێشترە(لە رووداوێکی هاتوچۆ بەهۆی ئۆتۆمبیلێکی وەزیری ناوخۆوە سێ کەس گیانان لەدەست دا ).*

*- جاری واش هەیە وەڵامی پرسیاری (لەکوێ) گرنگتر و لەپێشترە(لە دەروازەی کۆشکی سەرۆکایەتی بەهۆی رووداوێکی هاتوچۆوە، پاسەوانێك و دوو کەسی دیکە بریندار بوون).*

*- لە هەندی حاڵەتیشدا وەڵامی پرسیاری( کەی)لە وەڵامی پرسیارەکانی دیکە لەپێشترە( لە نوێژی نیوەڕۆدا، پێنج دز گەورەترین بانکی پایتەخت دەبڕن)*

دوای ئەوەی نووسەری هەواڵ بڕیار دەدات کامە وەڵام لە سەرەتای هەواڵەکە دابنێ، ئینجا دەست دەکات بەدانانی وەڵامەکانی دیکە، هەریەکە و بەپێی گرنگییان.

لە حاڵەتی هەبوونی ناوێك لە هەواڵەکە، یەکەمین جار ناوەکە هەمووی دەنووسرێت، بەڵام لەجاری دووەمدا تەنها ئاماژە بەناوی دووەمی کەسەکە دەدرێت، بەڵام ئەگەر هاتوو کەسایەتییەکە، هونەرمەندێکی دیار بوو، یان منداڵ و کەسایەتییەکی نزیك بوو لە جەماوەر، دەتواندرێ ناوی یەکەمی بنووسرێت.

سەبارەت بە ناونیشانی وەزیفی یان(کار)، پێویستە ناونیشانەکە پێش ناوی کەسەکە بکەوێ، بەم شێوەیە،(وەزیری دەرەوەی عێراق فلانی کوڕی فلان رایگەیاند...، بالێۆزی ئەمریکا لە عێراق فلانی کوڕی فلان گوتی...، بەڕێوەبەری گشتی پەروەردەی سلێمانی فلانی کوڕی فلان لە پرێس کۆنفرانسێکدا...)، چونکە بایەخدانی میدیا بەو کەسایەتییە بەهۆی وەزیفەکەیەتی نەك ناوەکەی.

سەبارەت بە نازناو و ئەلقابیش، واباشە دەستەواژەی(بەڕێز، رێزدار، سەماحەتی، ئایەتوڵا...) بەکارنەهێندرێت.

دەکرێ نازناوە زانستییەکان وەك(دکتۆر پرۆفیسۆر، ئەندازیار، ژمێریار، ئابووری ناس...تاد)لە پێش ناوەکان بە کورتکراویی(د=دکتۆر) دابنێنین، بەڵام دەبێ ئاگاداری دووبارەنەکردنەوەی ئەو هەڵە باوە بین کە نازناوی (دکتۆر) بۆ هەڵگرانی بڕوانامەی پزیشکی بەکار دەهێنن، چونکە (دکتۆر) نازناوێکی زانستییە دەبێ تەنها بدرێتە پاڵ ناوی ئەو کەسانەی کە خوێندنی باڵایان دوای قۆناخی ماستەر لە پسۆرییەك وەرگرتییە، بەڵام هەڵگرانی بڕوانامەی زانکۆ پزیشکییەکان نازناویان(پزیشك)ە، و لەو ناونیشانەش پلەبەندیان هەیە وەك،پزیشکی گەڕۆك، و جێگیر و پێشکەوتوو و..تاد.

لەکاتی ناوهێنانی پلەدارانی سلکی پۆلیس و سوپاش، دەکرێ پلە سەربازییەکانیان بنووسرێ، وەك(لیوا، رائید، ئەفسەر،عەریف، رێپێدراو...تاد).

هەندێك هەواڵ پاشخانیان هەیە، یان بەهۆی لێدوانی بەرپرسێك، یان خۆنیشاندانی هاوڵاتیان دژی بڕیارێکی حکومەت، یان لە میانی دانانی بەردی بناخەی باڵاخانە یان پڕۆژەیەکەوە دروست دەبن، لەم حاڵەتدا دەبێ لە کۆتاییی هەواڵەکە ئاماژە بەو پاشخانە بدرێت، بۆ نموونە دەکرێ بڵێین:(جێی ئاماژە بۆکردنە ئەو لێدوانەی وەزیری ئاوەدانکردنەوە لە میانی دانانی بەردی بناخەی دروستکردنی کۆمەڵگەی نیشتەجێکردنی((.....))ەوە هات...).

## سەرچاوەكانی هەواڵ

سەرچاوەكانی هەواڵ ئەو نێوەند و لایەنانەن كە رۆژنامەنووس هەواڵ و زانیارییان لێوەردەگرێت.

ئەو سەرچاوانە بەگشتی دوو جۆرن، **یەكەمیان:** سەرچاوە نێوخۆییەكانن، ئەوانیش راسپێردراو (نێردرا)، لەگەڵ پەیامنێران دەگرێتەوە.

**دووەمیشیان:** سەرچاوە دەرەكییەكانە كە ئەمانە دەگرێتەوە:[(١)]

١/ئاژانسە هەواڵییەكان.

**٢/پەخشە نێوخۆیی و بیانییەكان.**

**٣/رۆژنامەی نێوخۆیی و بیانی.**

**٤/بڵاوكراوەكان.**

**٥/پرێس كۆنفرانسەكان.**

**٦/وەزارەت و دەزگا فەرمییەكان.**

سەرچاوەكانی هەواڵ جۆراوجۆرن، هەریەكە و لای خۆیەوە (بە جیاوازی جۆری هەواڵەكە)هەواڵ بۆ ئەو فەزایە دەوەشێنێ كە كۆمەڵگەی تێیدا دەژی، بۆیە ئاساییە سەرچاوەی هەواڵێك هاوڵاتییەكی ئاسایی بێ نەك لێدوانی بەرپرسێك یان زانیاری و داتای وەزارەتێك، هەندێجار هەواڵەكان خۆیان دێنە نێو ئۆفیسی رۆژنامە یان تەلەڤزیۆنێك، جاری واش هەیە دەبێ رۆژنامەنووس بەدوایاندا رابكا و بچێتە شوێنی روودانیان، حاڵەتی واش هەیە رۆژنامەنووس خۆی لە نەبووەوە هەواڵ دەخولقێنێ، زۆر جاریش هەیە ئاژانسە هەواڵییە نێوخۆی و دەرەكییەكان، و دەزگا ئیعلامییەكان دەبنە سەرچاوەی هەواڵ.بەشێوەیەكی گشتی من سەرچاوەكانی هەواڵ لەمانەی خوارەوەدا كۆدەكەمەوە:

---

(١)سەرچاوەی پێشوو، حەبیب كەركوكی،٢٠-٣٠

**یەکەم: کارمەندانی دەزگا رۆژنامەوانییەکان**

مەبەست لە کارمەندان هەموو ئەوانەن لە دۆزینەوەی هەواڵ و کۆکردنەوەی و نووسین و ئامادەکردنی بەشدارن، پەیامنێران و نێردراوان پشکی شێریان هەیە لە دۆزینەوە و گەیاندنی هەواڵەکان، ئەوان دەچنە شوێنی رووداوەکان و کۆبوونەوە و کۆنگرە و بۆنە و یادەوەرییەکان، ئەو شوێنانە سەرچاوەی گەرمی هەواڵن، هەروەها بەهۆی کۆنتاکی رۆژانە و بەردەوامیان بە خەڵکی، چانسی گەیشتنیان بە هەندێ هەواڵ و زانیاری لە کارمەندانی دیکە زیاترە.

هەندێ جار، ئەندامانی دەستەی نووسین و سەرنووسەر و بەرپرسانی دەزگاکان و وێنەگرانیش، هەریەکەیان بەپێی پسپۆڕێتیەکەیان، بەشدار دەبن لە پرۆسەی کۆکردنەوەی زانیاری، واباوە سیاسەتمەدار و بەرپرسان گەر مەبەستیان گەیاندنی هەواڵێکی نوێ بێ بە رای گشتی، لەرێگەی سەرنووسەر یان بەرپرسانی دەزگا ئیعلامییەکانەوە هەواڵەکە دەگەیەنن، بەمجۆرە سەرجەم کارمەندان، هەریەکە و بەپێی جۆر و سروشتی کارەکەی، دەبێتە بەشێك لە سەرچاوەی هەواڵ.

**دووەم: ئاژانسە هەواڵییەکان**

ئاژانسە هەواڵییەکان دوو جۆرن، نێوخۆیی و دەرەکی، لە ئاژانسە جیهانییە بەناوباونگەکان" فرانس پرێسی فەرەنسی France press، رۆیتەرزی ئینگلیزی Reuters، ئیسیۆشێد پرێسی ئەمریکی AP، و ئیترە تاسی روسی Itar tass.

فرانس پرێس کۆنترین ئاژانسی هەواڵییە لە مێژووی مرۆڤایەتی،ساڵی ١٨٣٥ز دامەزراوە، هەریەك لەو ئاژانسانە دیسپلین و بنەمای کارکردنی تایبەت بەخۆی هەیە، هەروەها زۆربەیان پەیپەرنامەی ئەخلاقی کارکردنیان هەیە کە لە نێوان کارمەندانی ئاژانسەکە وەك گرێبەستێکی ئەخلاقی کاری پێدەکرێت[١].

(١) کتێبێکم بە ناوی(ئیتیکی کاری رۆژنامەوانی)، هەولێر،خانەی موکریانی بۆ چاپ و بلاوکردنوە،٢٠١٢، ٦٦.

ئەم ئاژانسە جیهانییانە، خزمەتگوزاری وێنە و زانیاری و داتا و کاریکاتۆر و هەواڵ و راپۆرتە هەواڵ، بە زۆربەی زمانە زیندووەکانی جیهان، لە نێویشیاندا زمانی عەرەبی، بە بەشداربووانیان دەگەیەنن، هەروەها خەڵکی ئاسایش دەتوانێ سەردانی ماڵپەڕەکانیان بکا و لە هەندێ هەواڵ و زانیاری سوودمەند بێ.

ئاژانسە هەواڵییە نێوخۆییەکانیش، کە هەندێ کەس بە ئاژانسی نیشتمانی ناوی دەبەن، زیاتر ئەوانەن کە لەلایەن دەوڵەتەوە بەڕێوە دەبردرێن و سروشتی فەرمیان هەیە. ئەم شێوە ئاژانسە لە رۆژئاوا، و لەو میدیایەی بە لیبڕاڵ ناو دەبرێت بوونی نییە، بەڵام لە جیهانی سێیەمەدا هێشتا بەردەوامە، وڵاتانی عەرەبی تەنها وڵاتی لبنانی لێدەرچێت هەموویان ئاژانسە هەواڵی لەوجۆرەیان هەیە، لە عێراقیش ئاژانسە هەواڵێکی نیمچە فەرمی هەیە بەناوی (واع) لەلایەن دەستەی میدیای عێراقییەوە سەرپەرشتی دەکرێت.

لە هەرێمی کوردستانیش تا ئێستا بە مانا پیشەیەکەی هیچ ئاژانسێکی هەواڵی، نیشتمانی یان ئەهلی، بوونی نییە، لە کاتێکدا بوونی ئاژانسێکی پرۆڤێشناڵی لەو شێوەیە زۆر زەروور و گرنگە.

## سێیەم: هۆیەکانی راگەیاندن

دەزگا ئیعلامییەکان سەرچاوەی باشی هەواڵن بۆ یەگدی، رۆژ لەدوای رۆژ بایەخیان لەرووی گەیاندنی هەواڵ و زانیاری بەیەکتری زیاتر دەبێ.

زۆرجار هەیە رۆژنامەیەك هەواڵێك بڵاودەکاتەوە، پاشان ئاژانسێکی هەواڵی ناودار هەواڵەکە لەوەوە دەگوازێتەوە، دەرئەنجام بە تەواوی دونیادا بڵاوبێتەوە و دەکەوێتە دەستی هەموو لایەك.

ئەمڕۆ TV نێودەوڵەتییەکانی وەك، BBC، و CNN، و جەزیرە، بە ئامرازە ئیعلامییە سەرەکیەکانی هەواڵ هەژماردەکرێن، سەرچاوەی هەواڵی زۆرێك لە دەزگاکان ئیعلامییەکانی دونیان، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا جاری وا هەیە ئەوانیش

پەنا بۆ ئاژانسە هەواڵییە نێودەوڵەتی و نیشتمانی و دەزگا نێوخۆییەکانی وڵاتان دەبەن بۆ گواستنەوەی هەندێ هەواڵ و زانیاری[(١)].

لە ئێستادا، میدیای ئەلیکترۆنیش سەرچاوەیەکی گرنگی هەواڵە، سایت و ماڵپەڕەکان بەهۆی خێراییان لە گەیاندنی زانیاری و هەواڵ، سەرچاوەیەکی باشی هەواڵن بۆ جەماوەر و دەزگاکانی راگەیاندن.

### چوارەم: خزمەتگوزارییە ئیعلامییەکانی دەستگا و کەسایەتییەکان

زۆرێك لە کۆمپانیا و دەستگاکانی وەبەرهێنان و نێوەندە کلتووری و جڤاکییەکان، بەشی تایبەت بە گواستنەوەی هەواڵ و زانیارییان دامەزراندووە، ئەوان لەرێگەی کۆمەڵە گرێبەستێك لەگەڵ دەزگاکانی راگەیاندن، رۆژانە هەواڵ و چالاکییەکانیان دەوەشێنن.

هەندێك کەسایەتی گشتیش هەمان شت دەکەن، وێنە و هەواڵ و زانیارییەکانیان بۆ ئەو دەزگایانە دەنێرن.

### پێنجەم: جەماوەر

هەندێ جار سەرچاوەی هەواڵێکی یەکجار گرنگ و سەرنجڕاکێش، کەسێکی ئاساییە، عادەتەن ئەو جۆرە هەواڵانە خۆیان دێنە ئۆفیسی دەزگاکان، یان کەسێك پەیوەندی بە پەیامنێر یان ئۆفیسی دەزگاکەوە دەکات بۆ گەیاندنی زانیارییەك، یان رووداوێك کە لە شوێنی کارکردن، یان لە رێگەی گەڕانەوەی بۆ ماڵەوە، بینیویەتی.

جاری واش هەیە، هاوڵاتییەك بۆ بڵاوکردنەوەی کێشەیەکی کەسی، خۆی سەردانی ئۆفیسی دەزگاکە دەکا و زانیارییەکانیان پێدەدات.

---

**(١)** لە میدیای لبنانی تیبینی ئەوەم کردووە، رادیۆکان سەرچاوەی سەرەکی هەواڵە تازە و گرنگەکانن، زۆربەی زانیارییە دەگمەن و لێدوانە تایبەتەکان، رادیۆکان دەبنە سەرچاوەی، پاشان لەوانەوە TVو رۆژنامە و سایتەکان دەیگوازنەوە، ئەم سەبقەی رادیۆ لە لبنان لەکاتێکدایە کە رادیۆ وەك کەرەستەیەکی راگەیاندن لە دونیای ئەمڕۆدا بەشێکی زۆر لە پێگە و جەماوەری جارانی لەدەست داوە !!

**شەشەم: ئەکاونت و پەیجە کەسییەکان(سۆشیال میدیا)**

سۆشیال میدیا پانتاییەکی فراوانی لە ژیانی مرۆڤی ئەم رۆژگارە هەیە، رۆڵێکی دیار لە بڵاوکردنەوەی هەواڵە کەسی و دەگمەنەکان دەبینێ، بەتایبەت ئەو زانیاری و وێنانەی، بەهۆی یاسا و بنەما ئیتیکیەکانی کاری راگەیاندنەوە، ئامرازەکانی راگەیاندن ناتوانن بڵاویان بکەنەوە، هەروەها ئامرازێکی باشی پەیوەندیکردن، و بەردەوامیدانی پەیوەندییەکانە.

لە رووداوەکانی بەهاری عەرەبی، سۆشیال میدیا حزوری بەرچاوی هەبوو، لە هەندێك هەواڵ و رووداودا رۆڵی یەکلاکەرەوەی بینی، جارجارە دەبووە سەرچـــــــاوەی هەواڵـــی زۆرێـك لە دەزگا و ئاژانســـە هەواڵییە بە ئیعـــتیبارەکانی دونیا.

رۆڵی ئەم میدیایە لە بەهاری عەرەبی تەنها لە بازنەی گەیاندنی هەواڵدا چڕنەبوەوە، بەڵکە فەزایەکی ئازادی بێ سانسۆریش بوو لەبەردەم جەماوەر، بەتایبەت پاش قەدەخەکردنی پەخش و کارکردنی دەزگا ئیعلامییەکان لە لایەن دەسەلاتدارانەوە.

هەنوکە، هەندێك لە سیاسەتوان و بەرپرسان، هەواڵ و چالاکییەکانیان لەرێگەی لاپەڕەکانیانەوە بڵاودەکەنەوە، ئەکاونتەکانیان شوێنی وەشاندنی بڕیارە گرنگ و لێدوانە ئاگرینەکانیانە.

سەرۆکی هەرێمی کوردستان، زۆرجار پەیام و بۆچوونەکانی لەرێگەی لاپەڕەی تایبەتی خۆی لە فەیس بووك، بە جەماوەر دەگەیەنێ، سەرۆك وەزیرانی پێشووی لبنانیش(سەعد حەریری)، تەواوی لێدوان و بیروڕاکانی دەربارەی بارودۆخی نێوخۆی لبنان و سوریا، بەهۆی لاپەڕەکەی لە تویتەرەوە بڵاودەکاتەوە.

لە میسریش، دوای لەکار لادانی (محەمەد مورسی) سەرۆکی پێشووی ئەم وڵاتە لەلایەن سوپاوە و دەستبەسەرداگرتنی لە بارەگای گاردی کۆماری، هەموو دونیا چاوەڕێی کاردانەوە، و راگەیاندراوێکی (مورسی)یان دەکرد، بەڵام کاردانەوەکە لە

میدیای تەقلیدییەوە نەهات، بەڵکە لە رێگەی ئەکاونتەکەی لە فیس بوك بە دونیا گەیەندرا.

بەکورتی سۆشیال میدیا سەرچاوەیەکی گرنگی هەواڵە، بەڵام ئیشکالیەتی سەرەکی ئەو میدیایە، رادەی مسداقیەت و راست و دروستی هەواڵ و وێنە و زانیارییە بڵاوکراوەکانیەتی، لەگەڵ چۆنیەتی لێکجیاکردنەوە و هەڵاوێردکردنی هەواڵ و وێنە دروستەکانە لە موزەیەف و ناڕاستەکان.

**حەوتەم: سەرچاوە شاراوەکانی هەواڵ**

سەرباری ئەو سەرچاوە دیار و ئاشکرایانەی هەواڵ، چەند سەرچاوەیەکی دیکەی نادیار لە سەرجەم بوارە جیاجیاکانی چالاکی مرۆڤ هەن، رۆژنامەنووس دەتوانێ لێیانەوە هەواڵ کۆبکاتەوە.

رۆژنامەنووسی زیرەك ئەو رۆژنامەنووسەیە سەرەتا ئەو سەرچاوانە دیاردەکات، ئینجا هەوڵی دروست کردنی رایەڵە و پەیوەندی شەخسیان لەگەڵ دەدات، پەیوەندییە شەخسییەکان رۆڵی گرنگ لە دونیای میدیادا دەبینن.

هەواڵی سیاسی گەرم لە سێ سەرۆکایەتیەکەوەیە، سەرۆکایەتی پەرلەمان، سەرۆکایەتی کۆمار، یان کۆشکی شاهانە، سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیران، دەبێ رۆژنامەنووس پەیوەندی لەگەڵ بەرپرسی راگەیاندن یان فەرمانبەرە پلە بەرزەکانی ئەو سەرۆکایەتیانە باش و بەتین بێ.

کەسایەتییە سیاسییەکانی وەك، وەزیر و پەرلەمانتارانی پێشوو، کەسانی کاندیدکرا و بۆ ئەندامیەتی پەرلەمان، و پۆستەکان، سەندیکاییەکان و بەرپرسانی رێکخراوە نیمچە حکومییەکان، هەموو ئەوانە سەرچاوەی نا ئاشکرای هەواڵی گرنگن کە لەوانەیە بەشێکی زۆری رۆژنامەنووسان هەستی پێ نەکەن.

بۆ هەواڵە پەروەردەییەکانیش، وەزارەتی پەروەردە و بەڕێوەبەرە گشتییەکان و سەرپەرشتیار و پەیمانگە و کۆلیژەکان و مامۆستایان، سەرچاوەی باشی هەواڵی پەروەردەیین.

ئسلوبی رۆژنامەنووس و کەسایەتییەکەی، کاریگەری دیاریان هەیە لە دروست کردنی پەیوەندی شەخسی لەگەڵ کەسانی خاوەن نفوز و پەیوەندار بە هەواڵ.پێویستە میدیاکار خاوەن کەسایەتییەکی دیپلۆماسی بێ، بەرێك وپێکی و رێزەوە قسە بکات، هەردەم هەوڵ بدات نمرەی مۆبایلی کەسیی لایەنە پەیوەندارەکان بەهەواڵ پەیدا بکات، و بە شەخسی دەربارەی بابەتەکەی قسەیان لەگەڵ بکات.

وەك جۆرێك لە دیپلۆماسیەت و خۆنزیك کردنەوە، دەکرێ رۆژنامەنووس و دەزگاکەکەی جار جار دیاری رەمزی وەك(قەڵەم، کراس، پەرداخ، بڕوانامەی رێزلێنان..تاد) کە لۆگۆی دەزگاکەی لەسەر چاپ کرابێ، بە کەسایەتییە دیارەکان، هەروەها بەوانە ببەخشن کە لە زانیاری و لێدوان و هەواڵ گەیاندن هاریکاریان دەکەن.

## گەڕان بەدوای هەواڵدا

هەواڵە رووماڵ کراوەکان بەگشتی ئەو هەواڵانەن بەهۆی داوەت کردنی رۆژنامەنووس بۆ پرێس کۆنفرانسێك، یان بۆنە و چالاکییەکی حکومی، یان حزبییەوە دروست دەبن، یان هەندێ جار دووبارەکردنەوەی رووداوێك یان هەواڵێکە کە پێشتر لە کەناڵەکانی دیکەی راگەیاندن بڵاوبۆتەوە. واتا ئەم جۆرە هەواڵانە خۆیان بەسەر دەزگاکانی راگەیاندنەوە دەسەپێنن، وەك ئەو هەواڵانە نین دەزگاکە خۆی بەدوایاندا دەگەڕێت.

وەك ئاماژەمان پێدا جۆرێکی دیکەی هەواڵیش هەیە رۆژنامەنووس و دەزگاکەی خۆی بەدوایدا دەگەڕێت، بەڵام لە نێوان ئەو دووەشدا هەواڵێکی دیکە هەیە رۆژنامەنووس خۆی دروستی دەکات، واتا بە هەستەوەری رۆژنامەنووسیانەی بۆنی دەکات، و دەیکات بە هەواڵێکی تازە و نا دووبارە، کە لەوانەیە ببێتە سەرچاوەی هەواڵ بۆ چەندین کەناڵی راگەیاندن.

هەندێك رۆژنامەنووس هەستی رۆژنامەوانیان زۆر بەهێزە، لە دوورەوە بۆنی هەواڵ دەکەن، بەر لەوەی خەڵکی دیکە هەستی پێکات. لە داهێنانی ئەم جۆرە هەواڵانەدا میدیاکار هەم کارێکی نوێ و دانسقە پێشکەش دەکات، هەمیش

مەعلومە و مەعریفەیەکی تازە بە وەرگر دەدات، کە دواجار بە پۆزەتیڤی بەسەر کەسایەتی مەعنەوی خۆی و دەزگاکەی دەشکێتەوە، چونکە جەماوەر لە نێو رووداو و زانیارییە دووبارەکانی رۆژدا، و لە نێو زۆری و بۆری ئەمڕۆی کەناڵەکان، دەزانێ کێ موتەمەیزە، و هەواڵی تازە و نا تەقلیدیان پێدەدات.

جیاوازی سەرەکی نێوان رۆژنامەنووس و خەڵکی ئاسایی ئەوەیە، رۆژنامەنووس زووتر لە خەڵکی دیکە پەی بەو رووداو و زانیارییانە دەبات کە رۆژانە دێنە رێی.

زۆرجار لەسەر شەقام رووداوێك روودەدات، یان لە دانیشتنێکی گشتی قسەیەك دەکرێت، یان زانیارییەك دەدرکێندرێت، یان رووداوێك دەگێڕدرێتەوە، بۆ خەڵکی ئاسایی شتی نۆرماڵن، بەڵام رۆژنامەنووسی سەرکەوتوو بەدواداچوونیان بۆ دەکات، لەوانەیە یەکێك لەمانە ببێتە هەوێنی هەواڵێکی وا دانسقە، دەرئەنجام تەواوی ژیانی پیشەیی رۆژنامەنووسەکە بگۆڕێ و بەهۆیەوە ناو و ناوبانگێکی بێ سنوور دەربکات.

رۆژنامەنووس رۆژانە تووشی زۆر زانیاری و رووداو دەبێتەوە، بەڵام دەبێ بزانێ کامەیان شیاوی ئەوەیە بکرێتە هەواڵ.

کە دەڵێین دروست کردنی هەواڵ، مەبەستمان ئەوە نییە رۆژنامەنووس بێ هەبوونی هیچ بنەمایەکی هەواڵ، لەخۆڕا و لە ماڵەوە یان نووسینگەکەی، دەست بکات بەدارشتنی هەواڵێك، بێگومان ئەم کارە دژە بە بنەماکانی نووسینی رۆژنامەنووسی و ئیتیکی پیشەکە، وەلێ مەبەستمان ئەوەیە لە پەراوێزی لێدوانی بەرپرسان و پرێس کۆنفرانس و بۆنە و کۆنفرانسەکان، هەواڵی نوێ دابهێنێ.

لێدوانە رۆژنامەوانییەکان، بەتایبەت هی کەسایەتییە خاوەن نفوز و کاریگەرەکان، سەرچاوەی باشی بەرهەم هێنانی هەواڵی دیکەن، ئەم جۆرە هەواڵانە بە هەواڵە لێدوان ناو دەنێم، رۆژنامەنووسەکە دەچێت را یان کاردانەوەی کەسایەتیەکی سیاسی یان حکومی پەیوەندار بە لێدوانەکە، یان پسپۆرێك وەردەگرێت، دەرئەنجام لە لێدوانەکەوە هەواڵێکی سادە لە دایك دەبێت.

بۆ نمونە، گەر سەرۆکی پارتی دیموکراسی کوردستان لە کۆنفراسێکی حزبەکەیدا بڵێت" لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی داهاتوودا هاوپەیمانیەتی لەگەڵ هاوپەیمانیەتی

نیشتمانی شیعەکان نابەستین، ئەم گوتەیە وێڕای ئەوەی خۆی هەواڵێکی گرنگە، هاوکات بەدواداچوون بۆ لێکەوتە و کاردانەوەکانی، هەمدیس هەوێنی چەند هەواڵێکی گەرمە.

وتاری رۆژنامەنووسیش، کە بەژانری رادەربڕین و بۆچوونی شەخسی ناودەبرێت، فەزایەکی باشە بۆ دروست کردنی هەواڵی نوێ. پێویستە رۆژنامەنووس، بەتایبەت پەیامنێران بەردەوام موتابەعەی وتارە رۆژنامەوانییەکان بکەن، چونکە لەوانەیە راو و بۆچوونی نێو وتارەکان ببێتە هەوێنی هەواڵێکی تازە، یان هەر ماددەیەکی دیکەی رۆژنامەوانی. ئەم کردارە پێچەوانەکەشی هەر راستە، چونکە زۆرجار هەواڵێکیش دەبێتە فاکتەری نووسینی وتارێك، یان ئامادەکردنی ریپۆرتاژ و راپۆرتە هەواڵ.

ژانرە رۆژنامەوانییەکان لە کارلێکی بەردەوام دان، ئەم شتێك لەو وەردەگرێت، ئەویش لەوی دیکە، بەڵام دواجار هەواڵ شادەمار و بڕبڕەی پشتی کاری رۆژنامەوانییە.

- ***ئەم نموونەیە نیشانت دەدات چۆن لە هەواڵێکی بڵاوکراوە هەواڵێکی دیکە دروست دەکەی:***

*- **هەواڵەکە:** چەند رۆژێکە پایتەختی هەرێمی کوردستان جموجۆڵێکی سیاسی بەرچاو بەخۆوە دەبینێ، ئەو جموجۆڵە کە کۆمەڵێك لایەنی سیاسی و کەسایەتی دیار پێی هەڵدەستن، بۆ ئامادەکردنی پرۆژەیەکی چارەسەرییە لەپێناو قوتاربوون لەو تەنگژەیەی هەرێمی کوردستان بەهۆی ناکۆکییەکانی نێوان لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆن و دەسەڵاتەوە دەربارەی ئەنجامدانی ریفراندۆم لەسەر دەستوور تووشی هاتووە.*

- *بۆ دروستکردنی هەواڵێکی نوێ لەو هەواڵە بڵاوکراوەیە:*

*پەیوەندی بە کەسایەتییەکی سیاسی بکە کە دەیناسی، هەوڵ بدە زانیاری دەربارەی پڕۆژەکە لە رووی بیرۆکە و ماهیەتی و ئەوانەی لەپشتییەوە دەوەستن، وەربگری، گەر ئەو کەسایەتییە هەواڵەکەی بۆ پشتڕاستکردییەوە و هەندێك وردەکاری پێدای، دەتوانی هەواڵێکی تایبەت بەخۆت بەم شێوەیە بنووسی: فلانی کوڕی فلان ئەو هەواڵانەی پشتڕاست کردەوە کە باس لە ئامادەکاری چەند لایەن و کەسایەتییەکی سیاسی دەکەن بەمەبەستی گەڵاڵەکردنی پڕۆژەیەك بۆ قوتاربوونی هەرێم لەو تەنگژەیەی بەهۆی ناکۆکی لایەنکانی دەسەڵات و ئۆپۆزسیۆن لەسەر مەسەلەی دەستوور تووشی هاتووە، ناوبراو ئەوەی روونکردەوە، خاڵی سەرەکی دەسپێشخەرییەکە بریتییە.......... دەربارەی کەسایەتی و لایەنە بەشداربووەکانی پڕۆژەکەش فلان گوتی: ........*

## هەواڵی سادە

هەواڵی سادە ئەو هەواڵە کورتەیە ناوەڕۆکەکەی تەنها لە رووداوێك، یان لێدوانێك، یان دەرئەنجام و زانیارییەك پێك دێت. واتە هەواڵێکی مورەکەب و تێکەڵ نییە([1]).

کە دەڵێین لە رووداوێك، مەبەستمان ئەو هەواڵە رووداوانەیە، رووداوێك بۆ وەرگر دەگێڕنەوە، یان دەگوازنەوە، کە یەکانگیر و کۆکە لەگەڵ پێوەرەکانی بڵاوکردنەوە.

(1) فاروق أبو زيد: فن الخبر الصحفي،ط٣، بيروت، دار الشروق، مكتبة العلم،١٩٨٤، ٣٨.

مەبەستمان لە لێدوانێك، ئەو هەواڵە لێدوانانەن کە هەڵوێست و دیدگای کەسایەتییەکی (حکومی، سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، رۆشنبیری، وەرزشی، هونەری،....تاد) بە وەرگر دەگەیەنن.
دەرئەنجامە هەواڵیش، ئەو هەواڵە کورتانەن دەرئەنجام و زانیارییەکانی نێو (راپرسییەك، ئامارێك، توێژینەوەیك) بە کورتکراوەیی بە خوێنەر دەدەن.
لە هەموو حاڵەتەکانیشدا، دەبێ رووداو و لێدوان و دەرئەنجامەکان، هاوئاهەنگ و کۆك بن دەگەڵ پێوەرەکانی بڵاوکردنەوە.

- ***چەند نموونەیەك***

- *هەواڵە رووداو:*

*ئەمڕۆ بەیانی تەقینەوەیەکی بەهێز بەغدای پایتەختی هەژاند، و ٢٠ کوژراو و ٧٣ بریندارى لێکەوتەوە، تەقینەوەکە کە لەدووری کیلۆمەترێك لە ناوچەی گرین زوون روویدا، ترس و دڵە راوکێی لە نێو هاوڵاتیانی سڤیل دروست کرد، دوای تەقینەوکەش هێزەکانی پۆلیس ٤ کەسیان لە نزیك شوێنی رووداوەکە دەستگیر کرد....*

- *هەواڵە لێدوان:*

*ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران فلانی کوڕی فلان داوای دەست لەکارکێشانەوەی حکومەتی کرد، بەهۆی فەشەل هێنانی لە دابین کردنی ئەمن و ئاسایش بۆ هاوڵاتیان، هەروەها داتەپینی ئابووری وڵاتیشی خستە ئەستۆی سەرۆك وەزیرانەوە. دوێنێ ئێوارە لە لێدوانێکدا فلان لە ئەنجوومەنی نوێنەران بە رۆژنامەنووسانی راگەیاند.....*

***- هەواڵە دەرئەنجام و زانیاری:***

*بڵاوکراوەی ساڵانەی دەزگای ئاماری نیشتمانی ئەوەی خستەڕوو" لە ساڵی رابردوودا رێژەی لە دایك بوون بە بەراورد لەگەڵ ساڵی ٢٠١١، ٢٪ زیادی کردووە، بڵاوکراوەکە کە دەزگای ئاماری ناوەندی ئامادەی دەکات، باس لەوەش دەکات رێژەی مردن لە هەمان ساڵدا......*

وەك ئاشکرایە بوارەکانی هەواڵ جۆراوجۆرن، سیاسی، و ئابووری، و کۆمەڵایەتی، و کلتووری، و هونەری، و وەرزشی، و نئوخۆیی، و نێودەوڵەتی، و ...تاد، ئەم جۆرانە لە رووی هەیکەل و بینای نووسینەوە هیچ جیاوازییان لە نێواندا نیە، ئەوەی جیاوازە ئەزموونی دارێژەری هەواڵە لە بوارێکی نووسیندا، هەرچەندە تەمەن و ئەزموونی نووسەر لە بوارێك زیاتر بێ، ئەوەندە ئاسانتر دەتوانێ بابەتەکەی دابرێژێ و عەفەویانە و بێ بیرکردنەوە، بەشی هەرە گرنگی چیرۆکە رۆژنامەوانییەکە لە پێشەوەی دەقەکە دابنێ.

هەندێك هەواڵ پێویستیان بە مەعریفە و زانیاری قووڵ هەیە، مەعریفەی رۆژنامەنووس زیاتر لەرێی ئەزموونەوە کەڵەکە دەبێ، لە هەواڵ و بابەتە ئابوورییەکان، زمانی داتا و ژمارەکان پێگەی گرنگیان هەیە، نووسەری ئابووری دەبێ زانیاری باشی دەربارەی ئەساسیاتی ئابووری هەبێ تا زانستیانە خوێندنەوە بۆ دەرئەنجامەکان بکا، و ژمارەکانیش لە شوێنی پێویستی خۆیان بەکاربێنێ.

هەر لەو چوارچێوەیەدا گرنگە ئاماژە بۆ شێوە نووسینی هەواڵی دادگایی، یان قەزائی بکەین، ئەم جۆرە هەواڵە بە پێچەوانەی ئەوانی دیکە، تەکنیکی نووسینی هەرەمی رێك(Story)ی لەگەڵ بەکاردێت، واتە"هەواڵەکە لە شێوەی چیرۆکدا دەنووسرێتەوە، لەسەرەتادا خوێنەر ئامادە دەکات بۆ بابەتی هەواڵەکە، دوایی درێژەی هەواڵەکە، ئینجا، کۆتاییەکەی. زۆربەی رۆژنامەنووسانی رۆژئاوا ئەم

شێوازە لە باسکردنی ڕووداوی خۆش و سەرسوڕهێنەر و ناوازە، یان هەواڵی دڵتەزێن پەسند دەکەن، ئەوەیش بۆ ئامادەکردنی خوێنەر بۆ چیرۆکی هەواڵەکە تا دەگاتە ناو قوڵایی ڕووداوەکە"([1]).

لێرەدا گرنگترین زانیاری لە کۆتاییدا دادەندرێت، هەواڵەکە لە شێوازی گێڕانەوە و چیرۆك دەنووسرێت، حبکە و گرێی ڕووداوەکە لە کۆتاییدا چارەسەردەکرێت.

تا هەنوکەش میدیای عەرەبی، بەتایبەت گۆڤار و ڕۆژنامە عەرەبییەکان ئەو شێوە نووسینە بۆ دارشتنی هەواڵی دادگاکان بەکاردێنن، راپرسییە میدیاییەکان دەریان خستووە زۆرینەی خوێنەران حەزی لێدەکەن و تەفاعولیان لەگەڵی هەیە.

***نموونەی دارشتنی هەواڵێکی قەزائی بە شێوازی ستۆری:***

*ناسینی ئازا لەگەڵ نەوزاد بەهۆی ئەو نووسینگەیەوە بوو کە نەوزاد بەرێوەی دەبرد، و وای لە خەڵکی و ئازا گەیاندبوو دەتوانن لە زانکۆ ناودارەکانی جیهان، بێ هیچ مەرجێکی پێشوەختە، ئۆفەری قەبوڵیان بۆ وەربگرێ، ئازا لەگەڵ پێشکەش کردنی بڕوانامە و چەند بەڵگەنامەیەکی دیکە بە نەوزاد، نیوەی ئەو پارەشی پێدا کە لەسەری رێککەوتبوون بەرامبەر دابین کردنی ئۆفەرەکە، بەڵام پاش ماوەیەك ئەوەی بەخەیاڵی ئازا دا نەهاتبوو روویدا.......*

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، حەبیب کەرکوکی، ٣٩ .

## هەواڵی تێکەڵ، مورەکەب

هەواڵی تێکەڵ، لەسادەترین مانایدا ئەو هەواڵەیە کە زیاتر لە هەواڵێکی سادە لەخۆیدا کۆدەکاتەوە، واتە لە دوو یان سێ هەواڵی سادە پێك دێت، بەو مەرجەی هەموو هەواڵەکان یەك رووداوی میحوەری کۆیان بکاتەوە و لە خولگەی ئەودا بسورێنەوە.

بەو پێیە، هەر هەواڵێکی مورەکەب لەوانەیە لە" دوو لێدوان یان زیاتر، یان لێدوان و رووداوێك، یان رووداوێك و دەرئەنجامێك، یان لە روداوێك و لێدوانێك و دەرئەنجامێك پێك بێت، بەو مەرجەی هەموویان دەربارەی رووداوێك یان زانیارییەکی دیاریکراو بن[1].

رۆژنامەنووسی لێزان تەنها بە هەواڵی سادە رازی نابێت، بەردەوام هەوڵ دەدات هەواڵەکانی تێکەڵ بن، یان هەوڵی گۆڕینی هەواڵی سادە بۆ مورەکەب دەدات، چونکە بەم شێوەیە دەتوانێ سەرجەم لایەنەکانی رووداو یان بابەتەکە بخاتەڕوو و دەوڵەمەندی بکات.

بەڵام گرنگە ئەوەش بزانین مەرج نیە هەر هەواڵێکی سادەمان بینی هەوڵی گۆڕینی بۆ تێکەڵە هەواڵ بدەین، چونکە هەندێکیان پێویست بە گۆڕین ناکەن، هەر ئەوەندە هەڵدەگرن.

- ***تا پێتدەکرێ هەوڵی گۆڕینی هەواڵە سادەکان بۆ هەواڵی مورەکەب بدە:***

*- هەواڵێکی سادە: وەزیری خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی فلانی کوڕی فلان رایگەیاند((ئەمساڵ زانکۆکانی حکومەت ناتوانن وەك ساڵانی رابردوو قوتابی وەربگرن))ئەم قسانەی وەزیری خوێندنی باڵا لە*

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، فاروق أبو زید، ٤٥.

*میانی کردنەوەی ئەو کۆنفرانسە زانستییە نێودەوڵەتییە هات کە لە ٧-١٠ ئەم مانگە لە پایتەخت بەڕێوە دەچێت.*

*- بۆ گۆڕینی ئەم هەواڵە بۆ هەواڵێکی مورەکەب، پەیوەندی بە سەرۆکی ڕێکخراوێکی فێرخوازی خاوەن جەماوەر بکە، و رای بەرامبەر لێدوانەکەی وەزیر وەربگرە و لێی بپرسە، ئایا کاردانەوەیان چی دەبێ؟ ئەگەر وەزارەت لەو بڕیارەی پەشیمان نەبێتەوە، ڕێکخراوەکەیان چ بژاردە و ڕێگەچارەیەکی لەدەستە؟.......*

ئەرکی رۆژنامەنووس لەکاتی نووسینی هەواڵی تێکەڵدا خۆی لە دیاریکردنی زانیارییە گرنگەکان و پۆلێن کردنیان لە گرنگترەوە بۆ گرنگ دەبینێتەوە. لەو جۆرە هەواڵەشدا وەك هەواڵی سادە، تەکنیکی هەرەمی سەرەوژێرکراو پەیڕەو دەکرێت.

دەقی ئەو جۆرە هەواڵە بە لید، واتە دەستپێکێکی کورت دەست پێدەکات، کە کورتەی گرنگترین زانیاری هەواڵەکە دەخاتەڕوو، ئینجا هەواڵە سادەکان بەپێی گرنگییان یەك لەدوای یەك رێك دەخرێن، بەو مەرجەی لە دارشتنی ئەوانیشدا شێوازی هەرەمی سەرەوژێرکراو پەیڕەو بکرێ.

ئەگەر شێوەی ئەو جۆرە هەواڵە بە وێنە بخەینەڕوو، دەبینین لە هەرەمێکی گەورەی سەرەوژێرکراو پێك دێت، لید بنکەکەی پێك دێنێ، و هەرەمە گەورەکە لە نێو خۆیدا چەند هەرەمێکی دیکەی سەرەوژێرکراوی بچووك کۆدەکاتەوە.

بۆ بەستنەوەی هەواڵە سادەکان نووسەر دەتوانێ چەند دەستەواژەیەکی وەك(لە کاتێکدا، هاوکات، لەو کاتەدا، هاوتەریب لەگەڵ ئەم بابەتە، هەر سەبارەت بەم پرسە...تاد) بەکار بێنێ.

ئەگەر هاتوو چەند هەواڵێکی گرنگ بۆ رۆژنامەنووس دەسەبەربوو بەڵام کەناڵەکانی دیکەی راگەیاندن وەك tv و سایتەکان پێش رۆژنامەکە بڵاویان کردەوە، دەبێ لەو حاڵەتەدا رۆژنامەنووسەکە لە لیدی هەواڵەکەی، ئەو زانیارییانە بە پێش بخات کە نوێ و تازەن، ئەگەر گرنگیشیان کەمتر بێ.

هەر بۆ روونکردنەوەی زیاتر، گەر هاتوو میحوەری سەرەکی هەواڵێکی مورەکەب تەقینەوەیەك بێ لە بەیانیدا، یەکەم شت لەو رووداوە گواستنەوەی ژمارەی قوربانیانە، سەرجەم کەناڵەکان بەهۆی ئیعتیباری مرۆییەوە بایەخ بەو لایەنە دەدەن، بەڵام گەر لە ئێوارەدا دەزگا ئەمنییەکان باسیان لە بەرەوپێشچوونی لێکۆڵینەوەکان کرد بۆ گەیشتن بە ئەنجامدەرانی تەقینەوەکە، لێرەدا دەبێ نووسەر لیدی هەواڵەکەی بە نوێترین زانیاری دەست پێبکات، کە دەرکەوتنی سەرەداوی ئاشکرابوونی ئەنجامدەرانی تەقینەوەکەیە.

- ***هەواڵی مورەکەب لە چەند هەواڵێکی سادە پێك دێت، رایەڵەیەکی هاوبەش بەیەکتریان دەبەستێتەوە،:***

*دوێنێ هێزەکانی ئاسایش رێکارە ئەمنییەکانیان لە رۆژئاوای پایتەخت توندو تۆڵتر کرد، هاوکات دەسەڵاتی دادوەریش ئەو هەواڵانەی پشت ڕاست کردەوە کە باسیان لە دەستگیرکردنی دوو کەس کرد بەهۆی گومانی ئەنجامدانی ئەو تەقینەوەیەی کە بەیانی لە ناوچەکە روویدا و سێ کوژراو و دە بریندارى لێکەوتەوە.*

*لەکاتێکدا چەند کەسایەتییەکی حکومی حکومەتیان بەکەمتەرخەم وەسف کرد، کۆمەڵێك رێکخراوی ناحکومی نیەتی خۆیان بۆ سازدانی رێپێوانێك لە شوێنی رووداوەکە راگەیاند، بەمەبەستی ئیدانەکردنی هەموو کارێکی توندو تیژی.*

هێزە ئەمنییەکان بە پشتیوانی سوپا ۵۰۰ چەکداریان لە دەوروبەری ناوچەی تەقینەوەکە بڵاوەپێکرد...
لەو سەروبەندەدا دادوەری لێکۆڵینەوە دەستی بە لێکۆڵینەوە کرد....

- دوای لید، تێبینی ئەوە دەکرێ هەواڵە تێکەڵەکە لە پێنج هەواڵی سادە پێك دێت: رێکارە ئەمنییەکان لە ناوچەی رووداوەکە، لێدوانی بەرپرسێکی دادوەری، رووداوی تەقینەوەکە لە بەیانیدا، لێدوانی کەسایەتییە سیاسییەکان، و لێدوانی رێکخراوە ناحکومییەکان.

- لەم هەواڵەدا تێبینی ئەوەش دەکرێت، نووسەر رووداوی تەقینەوەکەی بەیانی لە سەرەتای هەواڵەکە دانەناوە، کە هۆکانی دیکەی راگەیاندن بەچڕوپڕی تیشکیان خستبووە سەر، بەڵکە زانیارییەکانی دوای تەقینەوەکەی لا گرنگتر بووە، بەهۆی نوێیی و تازەییان.

- تێبینی بکە، وردەکاری هەواڵە تێکەڵەکە، لەگەڵ هەواڵی توندوتۆڵ کردنی رێکارە ئەمنییەکان دەست پێدەکات.

- نووسەر دەستەواژەی(هاوکات) بەکاردێنێت بۆ کۆتایهێنان بە هەواڵە ئەمنییەکە، و چوونە نێو هەواڵی دادگا.

## هەواڵی نێوخۆیی

ئەگەر هەواڵ بڕبڕەی پشتی کاری ڕۆنامەنووسی بێ، ئەوا هەواڵی ناوخۆیش بڕبڕەی پشتی رۆژنامەگەری نیشتمانییە، ئەو جۆرە هەواڵە کە لە رووی هەیکەلی نووسینەوە هیچ جیاوازی لەگەڵ هەواڵەکانی دیکە نیە، ناوەڕۆکەکەی باس لە رووداوێکی ئەو کۆمەڵگەیە دەکات کە رۆژنامەکەی تێدا دەردەچێت.

بۆیە لە پێناسەکردنیدا دەتوانین بڵێین" هەواڵی نێوخۆیی هەواڵێکە گرێدراوی خواست و بایەخی ئەو جەماوەرەیە کە کەناڵە ئیعلامییەکەی تیادا پەخش دەکرێت. هەر بۆیە دەکرێ باس لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی وەزیران بکات گەر هاتوو کەناڵەکە نیشتمانی بوو، یان کۆبوونەوە و بڕیارەکانی ئەنجوومەنی شارەوانی، ئەگەر کەناڵەکە ناوچەیی بوو، یان کۆبوونەوەی سەندیکای ئەندازیاران، گەر کەناڵەکە پیشەیی بوو، واتە ئاڕاستەی توێژی ئەندازیاران کرا، ئیتر بەم شێوەیە.

هەواڵی نێوخۆیی رووماڵی گشت لایەنەکانی ژیانی ئەو جەماوەرە دەکات کە کەناڵەکەی تێدا پەخش دەکرێت، و میدیای نیشتمانی پانتاییەکی فراوانی بۆ تەرخان دەکات، بواری بایەخدانیشی رەنگاو رەنگە، هەر لە ئابووری و سیاسەتەوە، تا دەگاتە هونەر و وەرزش.

زۆربەی هەواڵە ناوخۆییەکان گێڕانەوە یان لایەنێکی فەرم (رەسمی)یان هەیە([1])، پێویستە لە کاتی داڕشتنی هەواڵدا لەبەر چاو بگیرێت، ئەو سیاغە فەرمییەش لایەنی پەیوەندار لە دەزگاکە(کەسایەتی مەعنەوی بێ یان ماددی) لە رێگەی هەماهەنگیکارێکەوە (ئاژانس، نووسینگە، پەیوەندییە گشتییەکان)بەسەر دەزگاکانی راگەیاندن دابەشی دەکرێت، بۆ نموونە وتەبێژ یان نووسینگەی

---

(١)مەبەستمان لە(فەرمی) تەنها داوودەزگاکانی حکومەت نیە، بەڵکە لایەنی پەیوەندارە، جا کۆمپانیا و بانك و هەر دەستگایەکی دیکەی تایبەت بێ، بۆ نموونە گەر کۆمپانیاییەك بڕیاری دەرکردنی ١٠٠٠ کارمەند بدات، ئەم بڕیارە سیفەتی رەسمی هەیە بۆ دەزگاکانی راگەیاندن.

راگەیاندنی سەرۆکی حکومەت موکەلەفە بە بڵاوکردنەوەی بەلاغ و هەواڵەکانی سەرۆك، بۆ کۆمپانیایەکیش بەشی راگەیاندن، یان پەیوەندییە گشتییەکان بەو کارە هەڵدەستێ.

رۆژنامەنووسی راستەقینە تەنها بە روایەی فەرمی رازی نابێت، بەدواداچوونی بۆ دەکات، تا لە رێگەی لێدوان یان سەرچاوەی تایبەتەوە هەموو لایەنەکانی بخاتەڕوو، هەروەك چۆن هەوڵی گۆڕینی هەواڵی سادە بۆ تێکەڵ دەدات.

## هەواڵی مانشێت

هەواڵی مانشێت، هەواڵی سەرەکی رۆژنامەیە، ئەم هەواڵە تایبەتمەندی بە رۆژنامە دەدات، لە سەرەوەی لاپەڕەی یەکەم، لە ناوەڕاست یان دەستەڕاستی لاپەڕەکە دادەندرێت (لەو رۆژنامانەی بە پیتی عەرەبی بڵاودەبنەوە، لەوانەیش کە بە پیتی لاتینین دەکەوێتە دەستە چەپ)، بە فۆنتێکی قەبارە گەورەتر لە مانشێتە فرعییەکانی لاپەڕەکە دەنووسرێت.

بەگشتی هەواڵێکی مورەکەبە، داڕێژەرەکەی لە دەستپێکیدا رەهەندێکی نوێی پێدەبەخشێ، تا وانیشانی بدات دووبارەکردنەوەی زانیاری کەناڵەکانی دیکە نییە.

دەبێ ناوەڕۆکەکەشی زانیاری تازەی تێدابێ، کە لە سەرچاوەی تایبەت، یان بەهۆی لێدوانی تایبەتەوە، لە کەسایەتییە پەیوەندار و خاوەن نفوزەکان وەرگیرابێ. کردار لەو جۆرە هەواڵەدا بە سیغەی رابردوو دەنووسرێ، تەنها لە دەستپێکدا نەبێ دەمی رانەبردوو بەکاردێت.

- ***هەواڵی مانشێت گرنگترین تێکستی رۆژنامەیە، بۆیە دەبێ تازە و زیندوو بێ***

*لە ئێستادا گۆڕەپانی سیاسی نێوخۆیی پێشهات و ئاراستەی نوێی بەخۆوە دەبینێ، سەرجەم رووداوەکان هێما بۆ کۆتا هاتنی تەنگژەی سیاسی وڵات دەکەن بەر لە هاتنی سەری ساڵی نوێ.لە کاتێکدا سەرۆکی*

*پەرلەمان(ناوەکەی) جەختی لەسەر پێشکەوتنی بەرچاو لە گفتوگۆکانی لەگەڵ سەرۆکی لیستی ئۆپۆزسیۆن (ناوەکەی) کرد، سەرۆکی حکومەت (ناوەکەی) بەسەردانێکی رەسمی بەرەو تورکیا بەرێکەوت.*

*- تێبینی بکە، رستەی دەستپێك رستەیەکی دروستکراوە بۆ پێدانی رەهەند بە زانیارییەکان کە هەواڵێکی مورەکەبە.*

*- نووسەر چەند زانیارییەکی نوێ دەخاتە پاڵ سەرچاوەکە.*

*- دەکرێ لێدوانێکی نوێ بۆ هەواڵەکە زیاد بکرێ، لەرێگەی وەرگرتنی بۆچوونی کەسایەتییەکی کاریگەر و پەیوەندار بە بابەتەکە.*

دەکرێ لە سەرووی هەواڵی مانشێت، جار جارە مانشێتی بابەتێکی دیکە بە فۆنتێکی بچووکتر، و بە باکگراوندێکی رەنگی تایبەت، دابندرێ، هەروها دەشێ لە تەنیشت هەواڵی مانشێت، لە بۆکسێکدا ستوونە هەواڵ، یان پێرست بۆ بابەت و لاپەڕەکانی ناوەوە دابندرێ.

## هەواڵ لە هەفتەنامە و گۆڤارەکاندا

لە رۆژنامەگەری چاپکراودا شوێنی راستەقینەی هەواڵ، رۆژنامەیە، بەو پێیەی رۆژنامە کارێکی ئیعلامی رۆژانەیە، و خەسڵەتی سەرەکی هەواڵیش نوێی و تازەییە. بۆیە وەك چۆن فەزای ژیانی ماسی ئاوە، ئاواش فەزای هەواڵەکان رۆژنامەکانە، بەڵام سەرباری ئەمە تانوکە هەفتەنامە و گۆڤارەکان پانتاییەکی دیار بۆ بڵاوکردنەوەی هەواڵەکان، بەتایبەتی هەواڵی سادە، تەرخان دەکەن.

لە گۆڤارەکاندا واباوە دەستپێك بە هەواڵ بێ، یان سەرەتای هەر بەشێك(سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، رۆشنبیری...تاد) بە هەواڵ بکرێتەوە.

گۆڤار و هەفتەنامەکان دوو جۆر هەواڵ لەخۆدەگرن:

یەکەمیان: ئەو جۆرەیە کە تایبەتە بە گۆڤارەکە، و خۆی وەریگرتووە، تەکنیکی نووسینیشی هەمان ئەو تەکنیکەیە کە باسمان کرد.

دووەمیان: ئەو جۆرەیە کە لە کەناڵە خێراکانی دیکە بڵاوکراوەتەوە، بەڵام ستاڤی گۆڤارەکە بە گرنگی دەزانێ بایەخی پێبدات، و دووبارە بڵاوی بکاتەوە.

تەکنیکی نووسینی ئەو جۆرەیان کەمێك جیاوازە لە شێوە باوەکانی نووسینی هەواڵ، لێرەدا دەبێ نووسەری هەواڵ رەهەندێکی نوێ بە هەواڵەکە بدات لە رێگەی زیادکردنی رستەیەك یان ئیزافەیەك بۆ لیدەکەی کە پێشتر لە هەواڵە کۆنەکەدا بوونی نییە، واباشە بۆ دارشتنی ئەو رستە نوێیە کردار(فعل) بە دەمی رانەبردوو بەکاربهێندرێت، چونکە ئەم سیاغەیە، ئیماژی نوێیەتی و هەبوونی شتێکی تازە بەوەرگر دەگەیەنێ.

- *هەوڵی زیادکردنی وردەکاریی بە هەواڵە کۆنەکان بدە، چونکە تازەیی و نوێبوونەوەی پێ دەدات:*

*زۆرێك لە ئامەدەبووانی ئاهەنگەکەی کچە گۆرانیبێژی عەرەبی (ئیلیسا) هەفتەی رابردوو لە بەیروت تێبینی ئامادەبوونی بەرێوەبەری پێشووی کارەکانی گۆرانیبێژ (راغب عەلامە)یان نەکرد، کە لەریزی پێشەوەی ئامادەبووان دانیشتبوو، لەگەڵ ئەوەی (ئیلیسا) لە گۆنگرە رۆژنامەوانییەکەی دوای کۆتاهاتنی ئاهەنگەکە هەواڵی کارکردنی لەگەڵ بەرێوەبەری پێشووی کارەکانی (عەلامە) پشتراست نەکردووە، بەڵام ئامادەبوونی نێوبراو لە ئاهەنگەکە، ئاماژەیە بۆ راستی هەواڵەکە.*

*هەر لەو کۆنگرە رۆژنامەوانییە (ئەلیسا) باسی لەوەش کرد......*

## راپۆرتە هەواڵ

هەندێك جار بە شرۆڤە هەواڵیش ناودەبرێت، ژانرێکە لە نێوان توخوبەکانی هەواڵ و وتاری رۆژنامەوانیدا دەوەستێت، شرۆڤەی قووڵ و بەدواداچوون و چارەسەری بۆ هەواڵ و رووداوەکانی رۆژ دەکات، هەوڵ دەدات رەهەند و مەوداکانی ئەودیوی هەواڵ بۆ وەرگر بگوازێتەوە، بەکورتی ژانرێکە بۆنی هەواڵ و رادەربڕینی لێدێت.

لە رووی زەمەنەوە نزیکە لە سیغەی دایك کە هەواڵە، بەڵام لول دراوی رەهەندەکانی هەواڵیشە کە لە رێگەی خوێندنەوە و شرۆڤەی قووڵ بەدیار دەخرێن، بۆیە دەتوانین بە تێکەڵەیەك لە هەواڵ و بیروبۆچوون ناوی ببەین.

دەقەکانی ئەم ژانرە تێکەڵەیەکن لە شرۆڤەکردن و دوو جۆرە زانیاری، زانیارییەکان بریتین لە زانیارییە باوەکان، لەگەڵ ئەوانەی دەدرێنە پاڵ سەرچاوەیەك، نێوەندێك، لایەنێك، چاودێرێکی سیاسی...تاد.

ناوەڕۆکی راپۆرتە هەواڵەکان بریتین لە رووداوێکی نزیك لە رووی زەمەنییەوە، وەك خۆنیشاندانی لایەنێك، یان لێدوانی بەرپرسێك، یان هەڵوێستی لایەنێکی سیاسی، یان بڕیارێکی حکومی و ....تاد.

لە رووی بونیەی دارشتنیشەوە واباشە بە سیغەی داهاتوو بنووسرێت، بە شێوەیەك حاڵەتی تازەیی و بەردەوامی بە راپۆرتەکە بدات.

شوێنی سەرەکی شرۆڤە هەواڵ، لاپەڕەی دووەمە، بەڵام لە ئێستادا زۆربەی رۆژنامە نێودەوڵەتییە بە ناوبانگەکان و نێوخۆییەکان، ئەم شێوازە لە زۆربەی لاپەڕەکان پەیڕەو دەکەن، و لە رێگەیەوە دوورایی و رەهەندەکانی ئەو دیوی هەواڵە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووریەکان و...تاد، شرۆڤە دەکەن.

بە بۆچوونی من گرنگی راپۆرتە هەواڵ لە میدیای نووسراودا رۆژ لە دوای رۆژ زیاتر دەبێ، چونکە کەناڵە خێراکانی راگەیاندن وەك تەلەڤزیۆن و رادیۆ و سایتە ئەلیکترۆنییەکان، چەکی هەواڵیان لەژێر پێی رۆژنامەگەری چاپکراو، بەتایبەتی رۆژنامەکان دەرهێناوە، رۆژنامە وەك جاران ناتوانێ لاف و گەزافی سەبقی رۆژنامەوانی بەهۆی هەواڵە لێبدات، ئەم حاڵەتە یەك لە تەحەدا هەنوکەییەکانی

بەردەم رۆژنامەیە، رۆژنامەکان بۆ راستکردنەوەی ئەو نا هاوسەنگییە، پێویستیان بە ئالیەتێکە بەشێك لە هەیبەت و خوێنەری جارانیان بۆ بگەڕێنێتەوە، باشترین کەرەستەش پەنا بردنە بۆ راپۆرتە هەواڵ.

گەر لە رۆژنامە کوردییەکان وردبینەوە، دەبینین تا هەنوکەش بایەخدان بە راپۆرتە هەواڵ بە مانا زانستییەکەی لە ئاستی سەرەتایی دایە، زۆر بەکەمی رۆژنامەیەك دەبینی بە دروستی شرۆڤە هەواڵ پێشکەش بکات، ئەوەی هەیە زیاتر دەچێتە خانەی دارشتنی هەواڵی مورەکەبەوە، بە گشتی لە رۆژنامەگەری کوردی جیاوازییەکی ئەوتۆ ناکرێت لە نێوان نووسینی هەواڵی تێکەڵ، و راپۆرتە هەواڵدا.

- ***راپۆرتە هەواڵ تێکەڵەیەکە لە شرۆڤە و دوو جۆرە زانیاری***

*- رۆژ لە دوای رۆژ قسە و زانیاری دەربارەی سەرهەڵدانی جیاوازی بیروبۆچوون لە نێوان لایەنەکانی زۆرینەی پەرلەمانی زیاتر دەبێ، ئەم رایەی چاودێران لەو لێدوانە دژ بەیەکانەی ئەندامانی لیستی دەسەلاتەوە سەرچاوە دەگرێت کە ناوە ناوە بۆ میدیاکان دەیدەن. چادوێران پێیان وایە لێدوانەکەی سەرۆکی لیستی زۆرینەی پەرلەمانی(ناوی کەسەکە) لە ئاهەنگی حزبەکەی، تەواو جیاوازە لە گەڵ ئەو هێڵە گشتییەی زۆرینەی نابراو لە ساتەوەختی هەڵبژاردنەکان بانگەشەی بۆ دەکرد، چەند سەرچاوەیەکی ئاگادار ئەم جیاوازییە بۆ کۆمەڵە فاکتەرێك دەگەڕێننەوە، لەوانە:.......*

*- تیبێنی بکە، نووسەر بینائی شرۆڤەکەی لەسەر کۆمەڵە زانیارییەکی کۆن کردووە، ئینجا لە رێگەی پشت بەستن بە زانیارییەکانی چەند سەرچاوەیەك، سیفەتی تازەیی و بەردەوامی بە راپۆرتەکە بەخشیووە.*

## رووماڵکردنی هەواڵ

کە میدیا بڕیاری بایەخدان بە رووداوێك دەدات، دەیکاتە هەواڵ، واتە یەك لە رۆژنامەنووسانی هاوشان لەگەڵ وێنەگرێك بۆ شوێنی رووداوەکە رەوانە دەکات بۆ تۆمارکردنی ئەوەی روودەدات، ئینجا گەڕانەوە بۆ نووسینگەی کەناڵەکە و داڕشتنی هەواڵێك، ئەو پرۆسەیە بە زمانی پیشەیی، بە رومالکردنی هەواڵ ناو دەبرێت.

رومالکردن سادەترین جۆرەکانی کاری رۆژنامەوانییە، میدیاکار لە شوێنی رووداودا، تەواوی وردەکارییەکان تۆمار دەکات، دواتر بە شێوازی نووسینی هەرەمی سەرەوژێر کراو دایدەڕێژێت. زۆربەی کات هەواڵە رووماڵکراوەکان هەواڵی سادەن، وەڵامی پێنج پرسیارە سەرەکییەکە دەدەنەوە، ناوەڕۆکیان بریتیە لە، لێدوان، یان رووداو، یان دەرئەنجام.

رۆژنامەنووس داڕشتنەکەی بە لیدێکی کورت دەست پێدەکات، گرنگترین زانیاری تێدا کۆدەکرێتەوە، ئینجا وەڵامی پێنج پرسیارە تەقلیدییەکە دەداتەوە، و ناوی کەسایەتییە ئامادەبووەکانیش تۆمار دەکات، ئینجا دەست دەکات بە گێڕانەوەی رووداوەکە وەك خۆی، بە پێی پلەبەندی روودانی، هەیکەلی زمانەوانی نووسینەکەشی لەسەر کرداری رابردوو بونیاد دەنێ.

دەبێ رۆژنامەنووس ورد و بە دیقەت بێ لە تێبینیکردنی وردەکارییەکان، وەك، نووسینی ناوی ئامادەبووان، ئاگاداربوون لە هەرچییەك کە روودەدات. لێزانی رۆژنامەنووس لە تێبینی کردنی وردەکارییەکان بە دیار دەکەوێ، هەندێك رۆژنامەنووس لە رێگەی تەوزیف کردنی وردەکارییەکان لە پەراوێزی هەواڵدا، نەکهە و چێژێکی تایبەت بە دەقەکە دەدەن.

هەروەها رۆژنامەوانی لێهاتوو شوێنی رووماڵکردن ئیستیغلال دەکات بۆ ئەنجامدانی کورتە چاوپێکەوتن، و لێدوانی، تایبەت، و وەرگرتنی مەوعید لەو بەرپرسانەی لەو شوێنانە نەبێ، دیتنیان زەحمەتە.

**• ئەم نموونەیە روونیدەکاتەوە چۆن بە هۆی رووماڵەوە هەواڵێکی سادە بەرهەم دێت، و وردەکارییەکان چۆن تۆمار دەکرێن:**

- وەزیری بەرگری فلانی کوڕی فلان رایگەیاند، حکومەت بە نیازی کڕینی ٢٥ فرۆکەی جەنگییە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، هەروەها باسی لەوەش کرد وەزارەتەکەی پارەی تایبەتی لە بودجەی ساڵی داهاتوو بۆ ئەم مەبەستە جێگیر کردووە، هەروەها گوتی: "ئەم هەنگاوە وابەستەی پێویستییە سەربازییەکانی هێزی ئاسمانییە، و ئامانج لێی تەنها لایەنی بەرگرییە".

- ئەم لێدوانانەی وەزیری ناوخۆ، دوێنێ لە میانی کردنەوەی کۆنفرانسێك هات لە ژێر ناوی "ستراتیژیەتی داهاتووی بەرگری نیشتمانی "کە لە لایەن کۆمەڵەی جەنگاوەرە دێرینەکان لە هۆڵی گەل رێك خرا، و هەریەك لە.......(١). بابەتیان پێشکەش کرد.

- سیمینارەکە کەهەریەك لە.... (٢)، و ژمارەیەکی بەرچاو لە پسپۆرانی ئەو بوارە .تێیدا ئامادەبوون، بە سرودی نیشتمانی دەستی پێکرد، بە دوای ئەودا وتاری سەرۆکی کۆمەڵەی جەنگاوەرە دێرینەکان خوێندراوە تیایدا تیشکی خستە سەر ئامانجەکانی رێکخستنی ئەو سیمینارە....

- نووسەر ناوی قسەکەرانی سیمینارەکەی نووسیوە (١)، لەگەڵ ناوی دیارترین کەسایەتییە ئامادەبووەکان (٢).

- رۆژنامەنووسەکە قسەی وەزیری بەرگری لە هەموو قسەکانی تر لا گرنگتر بووە، بۆیە لە لیدی هەواڵەکە دایناوە، ئینجا باسی لە وردەکارییەکانی رووداوەکە بە

*شێوەی پلە بەند وەك ئەوەی روویداوە، کردووە، پاشان گوتەکانی دیکە، گوتی...، باسی لەوەش کرد...*

*- ئەگەر لە نێو ئامادەبووان کەسایەتییەکی دیار هەبوو، وتەیەکی پێشکەش کرد، بەڵام قسەکانی هیچ بنەمایەکی بڵاوکردنەوەیان تێدا نەبوو، و پەیوەندی بە بابەتەکە نەبوو، رۆژنامەنووس تەنها ئاماژە بەناو و وتەکەی دەدا، بێ ئەوەی باس لە ناوەڕۆکی قسەکانی بکات.*

## رۆژ ژمێری رۆژنامەنووس

رۆژ ژمێری رۆژنامەنووس کەرەستەیەکی رۆژنامەوانییە وەك قەڵەم و کامێرا و ریکۆردەری رۆژنامەنووس. دەفتەرێکی بچووکە، بەردەوام لە جانتا یان باخەڵی میدیاکار دایە.

ئەو دەفتەرە تەنها ناوی کەسایەتی و ژمرەی تەلەفۆنەکانیانی تێدا نانووسرێ، بەڵکە سەرچاوەکانی رۆژنامەنووس و مەوعید و وادەی ئەو بەرنامە و ریپۆرتاژانەشی تێدایە کە رۆژنامەنووس بە نیازی موتابەعەکردنیانە، هەروەها وادەی کۆنگرە رۆژنامەوانی، و چاوپێکەوتن، و کردنەوەی پێشانگە و خۆنیشاندانیشی تێدا دەنووسێ، لەگەڵ هەموو بۆنە و یاد و یادەوەرە نیشتمانی و جیهانییە گرنگەکان.

رۆژ ژمێر رۆڵی بەرچاو لە رێکخستنی کارەکانی رۆژنامەنووس دەبینێ، هەندێ جار یارمەتی دەدات بۆ ئەنجامدانی سەبقێکی رۆژنامەوانی.

میدیاکاری ژیر هەر رۆژێکی نوێی کارکردن بە دوو کردار دەست پێبکات، یەکەمیان: چاودێری کردن و دەسنیشان کردنی رووداوەکان، دووەمیان:تەماشاکردنی رۆژ ژمێرەکەی.

مەبەستمان لە چاودێری کردن، خوێندنەوەی رۆژنامەکان و تەماشاکردنی دەنگو باسی رادیۆ و تەلەڤزیۆنەکانە بۆ زانینی نوێترین هەواڵ و زانیاری.

تەماشاکردنی رۆژ ژمێریش بۆ وەبیرهاتنەوەی مەوعیدەکان و ئەو کۆنگرە و بۆنانەن لەو رۆژەدا بەڕێوە دەچن. لەبەر رۆشنایی ئەم کارە رۆژنامەنووس بڕیار دەدات چی بکات و دەتوانێ چیش دوابخات، لە حاڵەتی روودانی پێشهاتێکی نوێشدا، یان راسپاردنی کارێکی بەپەلە لە لایەن دەزگاکەوە، دەبێ رۆژنامەنووس بەرنامەی ئەو رۆژەی دوابخات، و ئەولەویەت بە پێشهات و کارە بە پەلەکان بدات.

لەبەر رۆشنایی ئەوەی لەم بەشەدا پێشکەشمان کرد دەتوانم بڵێم:

هەردوو جۆری هەواڵ، مەیدانی و نووسینگەیی، بڕبڕەی پشتی رۆژنامەگەرین. هەندێك هەواڵ خۆیان بەسەر کەناڵەکان فەرز دەکەن، هەندێکی دیکەشیان دەبێ رۆژنامەنووس بەدوایاندا رابکات.رۆژنامەنووسی لێهاتوو هەموو کات هەوڵی گۆڕینی هەواڵی سادە بۆ مورەکەب دەدات.

# بەشی سێیەم

## چاوپێکەوتنی رۆژنامەوانی

## (رۆژنامە، TV، رادیۆ )

تەکنیکی چاوپێکەوتن

کێن ئەوانەی چاوپێکەوتنیان لەگەڵ دەکەین؟؟

ئامادەکاری و پرسیارەکان

چۆنیەتی دارِشتنی چاوپێکەوتن

پێشەکی چاوپێکەوتن

تایبەتمەندی چاوپێکەوتن لە نێوان رۆژنامە و رادیۆ و TV

چاوپێکەوتن بۆ رۆژنامە

چاوپێکەوتن بۆ رادیۆ

چاوپێکەوتن بۆ تەلەڤزیۆن

چاوپێکەوتن، یەك لە ژانرە رۆژنامەوانییە گرنگەکانە، بەشێوەیەکی بەرفراوان لە راگەیاندنی بیستراو و بینراو و خوێندراو بەکاردێت، لە چاوپێکەوتندا زانیاری پێویست دەربارەی بابەتێکی دیاریکراو، لە کەسێك، یان سەرچاوەیەك وەردەگیرێت.

ئەم ژانرە لە میدیای کوردی جگە لە چاوپێکەوتن، (گفتوگۆ، دیمانە، هەڤپەیڤین، ئینتەرڤیو، و دیدار) یشی پێ دەگوترێ. گرنگی چاوپێکەوتن لەوەدایە لە یەك کاتدا دەتوانێ ببێتە مادەی خام و سەرەتایی بۆ ژانرە رۆژنامەوانییەکانی دیکە، هەروەها ژانرێکی رۆژنامەوانی سەربەخۆش.

لە حاڵەتی یەکەمدا چاوپێکەوتن دەچێتە نێو ریپۆرتاژ، بەدواداچوون، وتار، و هەواڵ. ئەو کاتەی رۆژنامەنووس لە هەواڵدا پرسیاری (بۆچی و چۆن) لە شایەدێکی رووداو یان هەواڵ دەکات، ئەوا بە شێوەیەك لە شێوەکان چاوپێکەوتن ئەنجام دەدات. جاری واهەیە چاوپێکەوتن سەرچاوەی سەرەکی هەواڵە، وەك لە بەشی رابردوو ئاماژەمان پێدا، کاتێك دەمانەوێ هەواڵێکی نوێ بە پشت بەستن بە زانیارییەکی کۆن دروست بکەین، پێویستیمان بە چاوپێکەوتنی کەسێك دەبێ، هەروەها لە کاتی گۆڕینی هەواڵی سادە بۆ تێکەڵ، هەمدیس بە دوای وەرگرتنی بیروبۆچوون، یان هەڵوێستی کەسێك دەگەڕێین، ئەم کردارە ئەگەرچی بە لێدوان وەرگرتن ناو دەبرێت، وەلێ جۆرێکیشە لە چاوپێکەوتن.

هەروەها ئەو پرسیارانەی لە کاتی ئامادەکردنی ریپۆرتاژ، یان بەدواداچوون لە خەڵکی دەکەین، دیسان بەشێکن لە هەڤپەیڤین. هەندێ جار ئینتەرڤیو دەچێتە نێو وتارە رۆژنامەوانیەکانیش، وتارنووس هەیە تەواوی وتارەکەی لەسەر ئسلوبی دیمانەیی بونیاد دەنێ، دەستپێك، یان کۆتایی وتارەکەی بە گفتوگۆکردن دادەڕژێت.

لە حاڵەتی دووەمیشدا، چاوپێکەوتن ژانرێکی رۆژنامەوانی سەربەخۆیە، وەك تێکستێکی سەربەخۆ بڵاودەکرێتەوە، لەم بەشەدا بە تێروتەسەلی رۆشنایی دەخەینە سەر.

## تەکنیکی چاوپێکەوتن

چاوپێکەوتنیش، هاوشێوەی هەواڵ، و ریپۆرتاژ، و وتار، و...تاد، تەکنیك و شێواز و وردەکاری خۆی هەیە، کارێکی رەمەکی بێ رێسا نییە، هەندێك بابەت پێویستی بە هەڤپەیڤین نییە، هەموو رۆژنامەنووسێکیش ناتوانێ هەموو دیمانیەك بە سەرکەوتوویی ئەنجام بدات، هەروەها هەموو ئەوانەیش کە دیمانەیان لەگەڵ دەکەین، سایکۆ ۆ کەسایەتییان وەك یەك نییە، هەیانە کراوە و روونە، هەشە راڕایە، هەشیانە لە پرسیارەکان هەڵدێ و وەڵامی دروست ناداتەوە. لە رووی جۆریشەوە فرە رەنگە، چونکە چاوپێکەوتنەکان بە سەر سیاسی و کۆمەڵایەتی و وەرزشی و رۆشنبیری و هونەری و ..تاد، دابەش دەبن.

لێرەدا بە لەبەرچاوگرتنی هەموو ئەمانە، هەوڵ دەدەین تەکنیکی نووسین و ئامادەکردنی ئەم ژانرە بخەینەڕوو، بە شێوازێك لە ئەرزی واقیع و لەکاتی پراکتیزەکردندا، یارمەتی رۆژنامەنووس و فێرخوازانی ئەو بوارە بدات سوودی لێوەربگرن.

## کێن ئەوانەی چاوپێکەوتنیان لەگەڵ دەکەین؟؟

کە رۆژنامەنووس چاوپێکەوتن لەگەڵ کەسێك دەکات، رێگەی پێدەدا قسە دەربارەی بابەتێك بکات، زانیاری لەسەر هەیە، بۆیە مەرجی سەرەکی هەموو هەڤپەیڤینێکی سەرکەوتوو ئەوەیە رۆژنامەنووسەکە لەخۆی بپرسێت" ئامانجی لەو دیمانەیە چیە؟؟ وەڵام دانەوەی ئەو پرسیارە یارمەتی دەدات لە چ روویەکەوە زانیاری دەربارەی کەسەکە کۆبکاتەوە، و چ جۆرە پرسیاریشی لێبکات.

دیاریکردنی ئامانجی چاوپێکەوتنەکە، کاریگەری لەسەر قەبارە، و ژمارەی پرسیارەکان، و ئامادەکارییەکان هەیە، واتە قەبارە و جۆر و ژمارەی پرسیارەکان و ئامادەکاری، بە پێی ئامانجی ئینتەرڤیوەکە دەگۆڕێن، بۆ نموونە، پرسیارکردن لە کەسێکی ئاسایی لەسەر جادە دەربارەی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی، جیاوازە لەو

پرسیارانەی بۆ دیمانەیەك لەگەڵ بەرپرسێكی باڵای دارایی كە بەرپرسی یەكەمی سیاسەتی دارایی وڵاتە، ئامادەی دەكەی، هەروەها پرسیاری دروستكەری رووداوێك، لە گەڵ شاهێدێكی رووداوەكە دیسان جیاوازە، پرسیارەكان دەربارەی رووداوێك كە ئەمڕۆ روویداوە، جیاوازن لەو پرسیارانەی كە دوای ماوەیەكی زەمەنی دوور و درێژ، لە شاهێد یان بكەری هەمان رووداوی دەكەی.

بە شێوەیەكی گشتی، كۆمەڵە كەسایەتییەك هەن رۆژنامەنووس هەوڵی سازدانی دیمانەیان لەگەڵ دەدات، لەمانـــــەی خوارەوەدا كۆیـــان دەكەمەوە:

١/ **دروستكار، یان بكەری رووداو:** ئەو كەسەی دروستكاری رووداوەكەیە، وەك" ئەو وەزیرەی نەخشە رێگە یان پلانێكی داڕشتووە، ئەو بەڕێوەبەرەی دەستی لەكار كێشاوەتەوە، ئەو یاریزانەی لە ناوبژیوانی داوە، ئەو گۆرانیبێژەی لەگەڵ هاوپیشەیەكی بە شەڕ هاتووە...تاد.

٢/**گەواهیدەر (شاهید) ی رووداو:** ئەو كەسەی ساتەوەختی رووداني رووداوەكە لەو شوێنە ئامادەبووە، بەڵام نە لەدوور نە لە نزیك دەستی لە دروست كردنیدا نەبووە، بۆ نموونە، ئەو كەسەی لە شوێنی پێكدادانی دوو ئۆتۆمبیل ئامادەیە، یان لەو شەڕەی كە لە بازاڕی گەورە روویداوە، یان دارِمانی باڵاخانەیەك بەسەر كرێكاراندا، یان دروست بوونی شەڕ و پێكدادان لە یاریگەیەك لە نێوان هاندەرانی دوو تیپ...تاد.

٣/ **پسپۆڕ و شارەزایان:** ئەوانەی خاوەن ئەزموون و زانستن لە بوارە جیاجیاكان، و وەڵام و شرۆڤەی دروستیان دەربارەی رووداوەكان پێیە. وەك ئەو زانایەی باس لە هۆكارەكانی رووداني بومەلەرزە دەكات، یان فاكتەرەكانی بەرزبوونەوەی پلەكانی گەرما شیدەكاتەوە، یان چارەسەری گونجاو بۆ بەرەنگاربوونەی خۆڵ بارین دەخاتەڕوو، یان باس لە هۆكاری بایەخدانی رادەبەدەری حكومەت بە كەرتی نەوت دەكات، یان ئامانجەكانی بڕیاری توندكردنی سزاكانی هاتوچۆ لە سەر سەرپێچیكاران شیدەكاتەوە...تاد.

٤/**كەسانی خودان راو و بیروبۆچوون:** ئەوانەن پرسیاری راو وبۆچوونی شەخسیان لێ دەكرێت دەربارەی رووداوەكان، جەماوەر گوێ لە بیروبۆچوونەكانیان دەگرێ و بایەخیان پێ

دەدات، لەوانەیە کاریگەریشی هەبێ لەسەریان، وەك ئەو سەرەك کۆمار یان حکومەت یان سەرەك حزبەی وازی لە کاری سیاسی و حکومی هێناوە و ناسراوە بە سەراحەت و بێلایەنی، یان مامۆستایەکی بواری میدیا، یان قانونی دەستووری، یان رای ئەو یاریزانە دێرینەی پرسیاری دەربارەی یارییەك لێ دەکرێت...تاد.

**٥/ کەسایەتییە ناودارەکان (ئەستێرەکان):** ئەوانەن لە بوارەکەی خۆیان بە ناوبانگن، جەماوەر حەز لە بیستنی هەواڵ و را و بۆچوونیان دەکات، وەك ئەستێرەکانی بواری" سینەما، گۆرانی، وەرزش، نواندن، دەوڵەمەند، و پیاوانی کار...تاد.

**٦/هاوڵاتی ئاسایی:** هەر هاوڵاتیەك بێ، راو و بۆچوونی دەربارەی رووداو، دیاردە، هەواڵێك، وەربگیرێت، زۆربەی کات ئەو چاوپێکەوتنانە کورتن، لە پرسیارێك یان دوو پرسیار پێك دێن، عادەتەن لە شوێنە گشتییەکان ئەنجام دەدرێن.

## ئامادەکاری و پرسیارەکان

چاوپێکەوتن کردارێکە پێویستی بە خۆ ئامادەکردن هەیە، گەڵاڵەبوونی بیرۆکەی سازدانی دیمانەیەك، دەستپێکی ئامادەکارییەکانە، ئامانجی هەڤپەیڤینەکە و وەرگرتنی زانیاری دەربارەی کەسەکە و دانانی پرسیار و دیاریکردنی شوێن، هەموویان دەچنە خانەی خۆ ئامادەکردنەوە.

چاوپێکەوتنەکان دوو جۆرە پرسیار لە خۆدەگرن" ئەو پرسیارانەی پێشوەخت رۆژنامەنووسەکە ئامادەی کردووە، لەگەڵ ئەوانەی لە کاتی گفتوگۆ و وەڵامی میوانەکە دروست دەبن. هەموو دیمانەیەك ئەو کاتە ئامانجی خۆی دەپێکێ ئەگەر بە پێی پێویست هەردوو جۆری پرسیاری لە خۆیدا کۆکردەوە، چونکە ئەمە وادەکات هیچ پرسیارێك بە نادیاری، یان بێ وەڵام لەبەردەم وەرگر نەمێنێتەوە، یان میوانەکە قسە و زانیارییەك بدات بەڵام رۆژنامەنووسەکە لەسەری نەوەستێ و پرسیاری دیکەی لێنەکات.

لە کاتی لێدوان وەرگرتن، دەبێ رۆژنامەنووس بە گشتی پرسیارێك یان دوو پرسیار پێشوەخت ئامادە بکات، لە میانی وەرگرتنی لێدوانەکەش یەك دوو

پرسیاری دیکە بکات. واباشە پرسیارە ئامادەکراوەکان بۆنی ئەوەیان لێ بێت ئامانجی لێدوانەکە چییە، یان هۆکاری لێدوان وەرگرتنەکە چییە؟؟

- ***با پرسیارەکانت لە ئامانجی چاوپێکەوتنەکەتەوە سەرچاوە** بگرن، بە وردیش گوێ لە میوانەکەت بگرە:*
- *ئەگەر ئامانجت وەرگرتنی هەواڵ بوو: جەنابی وەزیر مانگێك بەر لە ئیستا وەزارەتەکەتان ریاگەیاند سەرقاڵی دارشتنی پلانێکی هاتوچۆن لە پێناو رێکخستنی هاتووچۆ و کەمکردنەوەی ئەو قەرەباڵغی و خنکانەی لە شەقامەکانی پایتەخت بەدیدەکرێت، ئەم پلانە بە کوێ گەیشت؟؟ با پرسیاری دووەمت لە وەڵامەکەی وەزیرەوە سەرچاوە بگرێ.*
-
- ***ئەگەر ئامانجی چاوپێکەوتنەکە گۆڕینی هەواڵێکی** سادەبوو بۆ مورەکەب: جەنابی نەقیبی سەندیکای رۆژنامەنووسان، ئەمرۆ لە میانی روماڵ کردنی خۆنیشاندانەکەی بەردەم پەرلەمان، هێزە ئەمنییەکان هێرشیان کردە سەر میدیاکاران وسێ رۆژنامەنووسیان بە سەختی بریندار کردووە، و ئێستا لە نەخۆشخانەن، هەڵوێستی ئێوە چی دەبێ، بەو ئیعتیبارەی ئێوە نوێنەرایەتی رۆژنامەنووسان دەکەن؟؟با پرسیاری دووەم لە وەڵامی نەقیبەوە هەڵبهێنجێندرێ.*

- **ئەگەر میوانی چاوپێکەوتنەکەت لە وەڵامی پرسیارێك گوتی:**

*بێگومان خزمەتگوزارییە تەندروستییەکان وەك تموحی ئێمە نییە، ئەو بوراەش وەك هەر بوارێکی دیکە کۆمەڵێك کەموکورتی هەیە،...*

*لێرەدا رۆژنامەنووس قسەکانی میوانەکەی دەپچڕێنێ و پرسیاری لایەنی بەرپرس و ناوی ئەو کەسانەی لێدەکات کە هۆکارن.*

چاوپێکەوتنە سەربەخۆکانیش، ئەوانەی وەك بابەتی سەربەخۆ دادەبەزن، ئامادەکاری و پرسیاری زیاتریان دەوێت، پێویستە رۆژنامەنووس زانیاری فراوان دەربارەی بابەتی دیمانەکە، و کسایەتی میوانەکەی کۆبکاتەوە.

ئەرشیفی دەزگاکە خەزینەیەکی زانیاری باشە، دەکرێ رۆژنامەنووس سوود لە بابەتە پەیوەندارەکان وەربگرێ بۆ داڕشتنی پرسارەکان و دەوڵەمند کردنی بابەتەکە . هەروەها دەتوانێ پەیوەندی بە کەسی نزیك و هاوکارانی میوانەکەی بکات تا زانیارییان دەربارەی وەربگرێ.

بە پشتبەستن بە هەموو ئەوانە، رۆژنامەنووس دەست بە دانانی پرسیارەکان دەکات، پرسیارە ئامادەکراوەکان وەك پرسیاری سەرەکی و میحوەری وان، جومگە سەرەکییەکانی بابەتەکە پێك دێنن، هەروەها وێستگە سەرەکییەکانی دیمانەکەش دیار دەکەن، کە لێیناوە ئاڕاستەی گفتوگۆکە لە دۆسیەیەکەوە بۆ یەکێکی دیکە دەگۆڕدرێ. داڕشتنی پرسیارەکان بەو شێوازە دەبێتە کلیلی گفتوگۆکردن لەسەر ئەو دۆسیانەی رۆژنامەنووسەکە گەرەیەکیەتی قسەیان لەسەر بکا و وەڵامی تەواوی دەربارەیان دەست بکەوێ .

لە کاتی ئەنجام دانی دیدارەکەش، پێویستە رۆژنامەنووس ئاگاداری تەواوی وەڵامەکان بێ، لەوانەیە لە سیاقی وەڵامەکان پرسیاری دیکەی بۆ دروست بێ، یان زانیاری و داتای وا بدات پێویست بە وەستان و روونکردنەوە بکات. گرنگ ئەوەیە

ڕۆژنامەنووس هیچ زانیاری و وەڵامێکی نا ڕوون، بێ پرسیارکردن بە مەبەستی ڕوون کردنەوەیان، جێنەهێڵێ. جاری وا هەیە زانیارییەکی زۆر پڕ بایەخ لە پرسیارێکی ئیعتیرازی ئامادەنەکراو لە دایك دەبێ.

وا باشە سەرەتا بە پرسیارە سادەکان دەست پێبکەین، پرسیارە قورسەکان بۆ دواتر هەڵبگرین، دەبێ نەرم و نیان و بە ڕێز بین لەگەڵ میوانەکە، وا خۆمان نیشان بدەین هیچ دەربارەی بابەتەکە نازانین، هەروەها بە هێما و جوڵاندنی برۆ و ئادگاری دەموچاومان، لە قسەکەرەکە بگەیەنین هاوڕاین لە گەڵی و بەوردی گوێمان بۆ وەڵامەکانی ڕاگرتووە، چونکە ڕۆژنامەنووسی باش گوێگرێکی باشە.

- ***پێش سازدانی دیمانەکە، پرسیار دەربارەی بابەت و کەسایەتییەکە بکە:***
  - *ئەگەر بتەوێ چاوپێکەوتن لەگەڵ وەزیری دارایی بکەی، دەبێ بزانی بواری بەرپرسیارییەتیەکەی" داهات، و بەکارخستن، و بودجەی گشتی، و سیاسەتی باجی و قەرزەکانی دەوڵەت و ...تاد دەگرێتەوە. بۆیە دەبێ چەند پرسیارێکی میحوەری بۆ هەریەك لە و بابەتانە ئامادەبکەی. کە لە دۆسییەك تەواو دەبی، دیمانەکە بەرە و دۆسیەیەکی دیکە ئاڕاستە بکە، بۆ نموونە بڵێ" دوای بودجە دەچینە سەر باسی داهاتی ساڵانەی دەوڵەت...*
  - *دەکرێ پرسیارە ئامادەکراوەکان بە زانیاری دەربارەی میوانەکەت دەست پێ بکەیت: جەنابتان بەوە ناسراون پێداگیری لە سەر کەمکردنەوەی ڕێژەی دامەزراندن لە کەرتی گشتی دەکەن، دوای نارەزاییەکان بەرامبەر قسەکانت، هێشتا لەسەر ئەو بۆچوونەت ماوی؟؟*

هیچ کات دەرگای گفتوگۆکەت بە بابەتی چاوپێکەوتنەکە مەکەوە، واتە راستەخۆ مەچووە سەر دیمانەکە، هەوڵ بدە باسی شتێکی گشتی، یان رووداوێکی رۆژی لەگەڵ بکەی، ئەگەر وێنە یا تابلۆیەکی جوانت لە ژوورەکەی بینی، پرسیاری دەربارەی لێبکە، ئەم پێشەکییە لە سەرەتاوە تەڕی و کراوەیی دەداتە دیمانەکەت، وادەکات قسەکار زووتر لەگەڵت تێکەڵ بێ، و عەفەویانە بکەوێتە قسەکردن.

هەردەم ئەوەت لەبەر چاو بێ سایکۆ و ئەزموونی هەموو کەسێك وەك یەك نییە، هەندێکیان پێشینەیان لەگەڵ میدیا و چاوپێکەوتن هەیە، لەوانەیە هەوڵ بدەن جڵەوی گفتوگۆکە بگرنە دەست و بێ پچڕانەوە قسە بکەن، هی واش هەیە هەر ئەوەتا قسە دەکات. لە هەردوو حاڵەتدا ئەوە رۆژنامەنووسە جڵەوی گفتوگۆکەی لەدەستە نەك میوانەکەی، چونکە دیدارەکە لە پێناو خوێنەر و ئامانجێك ساز دەدات، نەك لەبەر خاتری قسەکەرەکە، جا هەر پلە و پۆستێکی هەبێ.

کاتێك میوانەکەت لە سیاقی بابەتەکە دەردەچێ دەبێ بزانی چۆن دەیپچڕێنی و دەیهێنیتەوە سەر ئەسلی مەوزوعەکە. هەندێك جار حەزی قسەکەر بۆ قسەکردن ئەنجامی پۆزەتیڤی دەبێ، لەوانەیە زانیاری گرنگی لە دەم دەرچێ زۆر گرنگ و سوود بەخش بن بۆت. ئەگەر میوانەکەشت کەم دوو بوو و حەزی لە قسەکردن نەبوو، لەو حاڵەتەدا پرسیارە ئامادەکراوەکان باشترین چارەسەرین.

ئەگەر رۆژنامەنووس توانی ببێتە جێ متمانەی میوانەکەی، لەوانەیە زانیاری زۆ گرنگی پێ بدات، بەڵام داوای لێبکات ناوی نەهێنێت (سەرچاوەیەك حەزی نەکرد ناوەکەی بڵاوبکرێتەوە..)، لێرەدا دەبێ رۆژنامەنووس ڕێز لە داوا و مەرجەکانی قسەکەر بگرێت، هاوکات دەتوانێ بە زانیارییە نوێیەکە بابەتێکی دیکە دروست بکات.

# چۆنیەتی داڕشتنی چاوپێکەوتن

ئامانج و قەبارەی چاوپێکەوتن، شێوازی داڕشتنی دیاردەکەن، هەموو دیمانەیك جگە لە مانشێتی سەرەکی، پێشەکیش لەخۆدەگرێت، زمانی داڕشتنی دیمانە دەبێ روون و سادە بێ، خوێنەر بە ئاسانی تێیبگات.

بێگومان قسەکەر ناتوانێ بە زمانێکی ئەدەبیانەی دروست قسە بکات، وەڵامەکانی پێویستیان بە داڕشتنەوە هەیە، رۆژنامەنووس دەبێ بە ئسلوبی رۆژنامەوانی وەڵامەکانی رێك بخات، ئەمە یەك لە کارەکانی رۆژنامەنووسە.لە هەندێ حاڵەتدا (وەك هەبوونی پەندێکی میللی لە نێو وەڵامەکان، یان قسە لەسەر زمانی منداڵان..تاد) دەکرێ قسەکان وەك خۆیان بە زمانی بازاڕ لە ناو دوو کەوانە دابندرێن.

لە لێدوانە رۆژنامەوانییەکان، هەمان شێوازی نووسینی هەواڵ بۆ داڕشتنی چاوپێکەوتنەکان پەیڕەو دەکرێت، واتە ئسلوبی گێڕانەوەی هەواڵ بە سیغەی رابردوو، ئەگەر چاوپێکەوتنەکە نزیك بوو لە رووداوەکە، یان ئیزافەیەکی دەخستە سەر هەواڵەکە. بەڵام ئەگەر چاوپێکەوتنەکە وەك بابەتێکی سەربەخۆ بڵاوکرایەوە، دەبێ سیغەی رانەبردوو بەکار بهێندرێت.

- *لە داڕشتنی نا راستەوخۆی چاوپێکەوتنەکان، بە پێی جۆری زانیارییەکە مامەڵە بکە، تا دەتوانی دووریی و زەمەنیان پێ بدە:*

- *سەرۆکی سەندیکای رۆژنامەنووسان رایگەیاند، لە چەند کاژێری داهاتوودا ئەنجوومەنی سەندیکا بڕیاری یەکلاکەرەوە سەبارەت بە ئیقرارکردنی یاسا نوێیەکەی رۆژنامەگەری لە پەرلەمان دەدات....*

*تێبینی بکە نووسەر دەمی رابردووی بەکارهێناوە بۆ نزیك کردنەوەی لێدوانەکە لە رووداوەکە، کە ئیقرارکردنی یاسای رۆژنامەگەرییە*

- *بەڕێوەبەری گشتی کارەبای نیشتمانی پێی وایە پرۆسەی چاککردنەوەی تۆڕە نێوخۆییەکان پێویستی بە.....*

*تێبینی بکە نووسەر دەمی رانەبردووی لەگەڵ ئەو دەقە بەکارهێناوە کە وەك رادەربڕین بڵاودەکرێتەوە....*

لەو چاوپێکەوتنانەی بە سیغەی پرسیار و وەڵام بڵاودەبنەوە، رۆژنامەنووس دەتوانێ سیاغەیەکی نوێی ئاسان بۆ وەڵام و پرسیارەکان دابنێ، هەروەها دەتوانێ رستە و وەڵامەکانیش کورت بکاتەوە، یان وشەیەك لە شوێنی یەکێکی دیکە دابنێ، بەو مەرجەی ئاگاداری ناوەڕۆکیان بێ و مەفهومیان نەگۆڕێ.

هەروەها دەکرێ وەڵامە دوور و درێژەکان بە دانانی پرسیار بپچڕێنێ، بە تایبەت لەو کاتانەی قسەکەر درێژدادڕی دەکات، چونکە هەبوونی پارچەیەکی دوور و درێژ، مەلەل لای خوێنەر دروست دەکات.

لەو قسە و وەڵامانەش کە پێویستیان بە روون کردنەوەی زیاتر هەیە، دەکرێ (وەسفی جووڵەی دەست و حاڵەتی ئینفیعالی) قسەکەر بکرێت، واباشە دەمی رانەبردوو بەکار بهێندرێ (پێدەکەنی، دەستی لە دەستی دەدا...تاد).

## پێشەکی چاوپێکەوتن

چاوپێکەوتنە سەربەخۆ و دوور و درێژەکان کە بە سیغەی وەڵام و پرسیار دادەڕێژرێن پێویستیان بە پێشەکی هەیە، لەو پێشەکیەدا گرنگترین زانیاری چاوپێکەوتنەکە بێ وردەکارییەکان، لەگەڵ (ناوی بڵاوکراوە لە نێوان دوو کەوانە، یان لۆگۆکەی) دادەندرێت. لە رۆژنامەکان بکەر (فعل) لە پێشەکییەکان بە سیغەی رابردوو دەبێ، بەڵام لە گۆڤار و هەفتەنامەکان بە دەمی رانەبردوو دادەندرێت، چونکە سیغەی رانەبردوو زەمەنی ئێستا و بەردەوامی بە نووسینەکان دەدات. دەکرێ زەمەنی رانەبردوو لە رۆژنامەکانیش بەکاربهێندرێ، بەڵام هەرگیز رابردوو و رانەبردوو لەیەك بابەتدا کۆناکرێتەوە.

هەر لە پێشەکیدا رۆژنامەنووس دەتوانێ بۆنە و شوێنی دیمانەکە باس بکات. لە حاڵەتی چاوپێکەوتن لەگەڵ کەسایەتییە دیار و ئەستێرەکان، دەتوانێ بە شێوەی ستۆری چۆنیەتی رێکخستنی وادەی دیمانەکە و چۆنیەتی پیشوازی کردنی میوانەکە لە رۆژنامەنووس و وەسفی ئەو شوێنەی هەڤپەیڤینەکەی تێدا بەرێوە دەچێ، بۆ خوێنەر بگێرێتەوە. هەروەها دەکرێ لە بری هەموو ئەمانە ناساندنی میوانەکە و کار و دەستکەوتەکانی بکرێتە پێشەکی.

پێشەکی رۆڵی بەرچاو لە جوان نیشاندانی چاوپێکەوتن و هاندانی خوێنەر بۆ خوێندنەوەی دەبینێت، بۆیە چەند بە ئسلوبێکی جوان و سەرنج راکێش نووسرابێ و زانیاری گرنگ لەخۆیدا کۆبکاتەوە، هێشتا هەر کەمە.

دەکرێ پێشەکی لە نێو چوارچێوەیەك دابندرێ، یان بە فۆنتێکی جیاواز لەرووی قەبارەوە لە فۆنتی گشتی بڵاوکراوەکە بنووسرێ، یان باکگراوندێکی تایبەتی پێبدرێت، چونکە بوونی چوارچێوە لەو جۆرە بابەتانەدا لە دوو رووەوە خزمەت دەکات" یەکەمیان: زانیارییە گرنگەکان بە پوخت و کورت کراوەیی بە خوێنەر دەدرێ، دووەمیان: لە رووی دیزاین و شکلی گشتی دیمانەکە، جوانی و هەناسە بە بابەتەکە دەدات.

مانشێتیش بە هەردوو جۆرییەوە، سەرەکی، و لاوەکی توخمێکی گرنگی سەرکەوتنی دیمانەکانە، مانشێتە سەرەکییەکان پێویستە کورت و پوخت و رەوان بن، گوزارشت لە گرنگترین زانیاری چاوپێکەوتنەکان بکەن، لاوەکییەکانیش دەبێ بە زمانێکی سادە و روون بنووسرێن، هاوئاهەنگ بن لەگەڵ ناوەرۆکی ئینتەرڤیوەکە. رۆژنامەنووس دەتوانێ بە دوو شێواز مانشێتە لاوەکییەکان بخاتە روو، شێوازی یەکەمیان لە دێرێکدا بە ئسلوبی خۆی نەك دەقاو دەق، زانیارییەك دەنووسێ بەو مەرجەی هەمان مەفهوم بگەیەنێ، بەڵام لە دووەمیاندا زانیارییەکە بە ئسلوبی چاوپێکەوتنەکە، وەك خۆی دەقا و دەق دادەنێت.

***• پێشەکی چاوپێکەوتنەکان بە پێی جۆری بڵاوکراوەکە دابڕێژە***

*• بڵاوکردنەوەی لە رۆژنامە: کرداری رابردوو بە کار بێنە: سەرۆکی حکومەت (ناوەکەی) رایگەیاند: پلانی حکومەتەکەی بۆ چارەسەری کێشەی سووتەمەنی لە سەرەتای مانگی داهاتووەوە دەچێتە بورای جێیەجێکردن، هەروەها لە گفتوگۆکەی لەگەڵ (ناوی بڵاوکراوەکە)باسی لەوەش کرد....*

*• بڵاوکردنەوەی لە هەفتەنامە یان گۆڤار: کرداری رانەبردوو بەکار بێنە: هونەرمەندی ناودار (ناوەکەی) پێی وایە پێشخستنی بواری مۆسیقا و دروستکردنی گۆڕانکاری نەوعی پێویستی بە دوو توخمی سەرەکی هەیە...ناوبراو کە دکتۆرای لە مۆسیقا هەیە و ماوەیەکە سەرقاڵی ئامادەکردنی (ئینسکلۆپیدیای گۆرانی نەتەوەییە) لەدیمانەیەکی کورتدا لەگەڵ (ناوی هەفتەنامەکە) هێما بۆ ئەوەش دەکات...*

*• پێشەکیەکی وەسفی، یان ستۆری: کرداری رانەبردوو بەکار بێنە: وەرگرتنی وادەی دیمانەیەك لەگەڵ سەرۆك (ناوەکەی) کارێکی ئاسان نییە، دانبەخۆداگرتن و چاوەڕوانی دەوێت، دوای ٢ مانگ چاوەڕوانی، وەڵامی قەبولکردنی چاوەپێکەوتنەکەمان پێگەیشت،...*

هەندێك چاوپێکەوتن لە شوێنە گشتییەکان ئەنجام دەدرێت، پسپۆران بە چاوپێکەوتن یان کاری (مایکرۆ شۆستە) ناوی دەبەن، مایکرۆ شۆستە" ئەو چاوپێکەوتنە کورتانەن کە بە پرسیارێك یان دوو پرسیار وەڵامی جەماوەر دەربارەی

دیاردەیەك یان پرسێك دەگوازنەوە. ڕۆژنامەنووس پێشەکی ئەو جۆرە دیمانەیە لەسەر وەڵامی زۆرینەی میوانەکان دادەڕێژێ، دەکرێ لەو شێوە پێشەکییەدا، ئسلوبی سەرنج ڕاکێشان و گاڵتەئامێز بەکار بێت، بەڵام ئەگەر کرۆکی بابەتەکە باسێکی جدی بوو، هاوکۆکی ڕاوەرگیراوەکان لەسەر وەڵامێك دەکرێتە خاڵی سەرەکی پێشەکییەکە.

دوای پێشەکی و پرسیارەکان، وەڵامەکان بە کورت و پوختی دابڕێژە، هەوڵ بدە وەڵامەکان هێندە کورت بن بە چاوتروکانێك بخوێندرێنەوە و هاوئاوازی پرسارەکان و پێوەرەکانی بڵاوکردنەوە بن.

لەو چاوپێکەوتنانەی وەك بابەتی سەربەخۆ دادەبەزن، ناوی میوانەکە بەتەواوی لەگەڵ پیشە یان بەرپرسیاریەتییەکەی دادەندرێت، لەو چاوپێکەوتنانەش کە دەچنە نێو ریپۆرتاژ و بەدواداچوونەکان، ئەگەر هاتوو لە پێشەکیدا ئاماژەت بۆ ئەوە کرد کە پرسیارەکانت ئاڕاستەی فێرخوازانی زانکۆ دەکەیت تەنها نووسینی ناوی تەواوی فێرخوازەکە بەسە، چونکە پیشە و تەمەنی کەسەکە دیارە، بەڵام ئەگەر جۆری ئەو کەسانەی پرسیاریان لێ دەکەیت جۆرا و جۆر بوو، دەبێ لە تەنیشت ناوەکە، تەمەن و جۆری کارەکەیان بنووسیت.

مایکرۆ شۆستە کارێکی ڕۆژنامەوانی ئاسانە، ئامادەکردنی بۆ ڕادیۆ و تەلەڤزیۆنەکان ئاسانترە، جۆری پرسیار و کەناڵەکە، شێوازی داڕشتن و ئامادەکردنی دیار دەکەن.

*مایکرۆ شۆستە، ئامادەکردنی ئاسانە:*
*باشترین بێژەر لای تۆ کێیە؟ بۆچی؟*
*ژنان سەرنجڕاکێشترن....و زیرەکیش دوا پێوەرە*
*پڕ جەماوەرترین بێژەر لای فێرخوازانی زانکۆ بە هەردوو ڕەگەزیانەوە، بێژەرە ژنەکانن، لەوەڵامی پرسیارێکی (ناوی کەناڵەکە) دەربارەی باشترین بێژەر لای تۆ؟ زۆرینەی فێرخوازانی زانکۆ لە کوردستان جوانی و ڕێك پۆشیان لەسەرووی زیرەکی و مەعریفەی*

*بێەژەرەوە دانا، (فلانی کوڕی فلان)پسپۆری زمانی ئینگلیزی،زانکۆی.......*

## تایبەتمەندی چاوپێکەوتن لە نێوان تەلەفزیۆن و رادیۆ و رۆژنامەدا

جیاوازی بەرچاو لە نێوان ئامادەکردنی ئینتەرڤیو بۆ رۆژنامە و رادیۆ و تەلەڤزیۆن هەیە، بەو پێیەی یەکێکیان نوسراو، و یەکێکی دیکەیان بیستراو، و ئەوی دیکەشیان لە ئامرازە بیستۆکە- بینۆکەکانە، لێرەدا تایبەتمەندی هەریەکەیان بە جیا، بەم شێوەیە دەخەینە روو:[1].

## چاوپێکەوتن بۆ رۆژنامە

لەو چاوپێکەوتنە خوێنەر گوێی لە دەنگی رۆژنامەنووس و میوانەکەی نابێ، تەنها نووسینەکە دەخوێنێتەوە، ئەو چاوپێکەوتنە لە رووی تەکنیك و کردارەوە، کارێکی ئاسانە، رۆژنامەنووس تەنها پێویستی بە ریکۆردەر و کامیرا هەیە، یارمەتی کەسی دیکەی پێویست نییە (بۆ هەندێك دیمانەی تایبەت دەتوانێ کامێرامان) لەگەڵ خۆی ببات.

ئەگەر چاوپێکەوتنەکە وەك لێدوانێك بۆ هەواڵ وەرگیرا، دەکرێ لە رێگەی تەلەفۆنەوە ئەنجام بدرێ، بۆ وێنەش، پەنا بۆ ئەرشیف ببردرێت.

---

[1] مەغدید سەپان: ئەوانەی رۆژنامەنووس پێویستە بیانزانێ، چاپخانەی شەهید(ئازاد هەورامی)، کەرکوك، بەرگی دووەم، ٢٠١٢، ١٦٩_١٧١ .

## چاوپێکەوتن بۆ رادیۆ

جیاوازی چاوپێکەوتن بۆ رادیۆ بە بەروارد لەگەڵ رۆژنامە و گۆڤار لەوەدایە لە رادیۆدا دەنگی هەردوولا (رۆژنامەنووس و میوانەکەی) بڵاو دەبێتەوە، چاوپێکەتن بۆ رادیۆ لە رووی ئامادەکردنەوە ئاسانترە، چونکە پێویست بە نووسینەوەی وەڵامەکان و رێکخستنی زمانەوانی ناکات، تەنها ئەوە نەبێ دەنگی هەردوولا (پرسیار و وەڵامەکان) لە تۆمارەکە دەربچن. لێرەدا تەکنەلۆژیا رۆڵ دەبینێ لە تۆمارکردنی دەنگەکان بە رێك و خاوێنی، بێ تێکەڵ بوونی دەنگی لابەلا لەگەڵیان.

ئەگەر وەڵامەکان درێژ بوون، یان هەندێکی پەیوەندی بە پرسیاری رۆژنامەنووسەکەوە نەبوو، دەکرێ لە رێگەی مۆنتاژەوە قوت و کورت بکرێنەوە.

لەبەر ئەوەی رادیۆ ئامرازێکە پشت بە دەنگ دەبەستێ، بۆیە کاسێت وریکۆردەرەکە، و شوێنی ئەنجامدانی دیمانەکە گرنگن، دەبێ شوێنی چاوپێکەوتنەکان هێمن، دوور لە ژاوە ژاو و دەنگی ئۆتۆمبێل بن، واباشە رۆژنامەنووس مایکرۆفۆن بەکاربهێنێ.

هەندێك جۆری چاوپێکەوتن دەخوازێ دەنگی باکگراوند یان دەوروبەرەکەشی لەگەڵ دەربچێ، بۆ نموونە ئەگەر چاوپێکەوتنەکە لەگەڵ مامۆستایەك بوو لە قوتابخانە، باشترە دەنگی هاتو و هاواری فێرخوازەکانیش تۆمار ببێ، یان گەر چاوپێکەوتن بوو لە بازاڕ با دەنگی خەڵك و دوکاندارەکانیش تۆمار ببێ، ئەو دەنگە زیندوویی بە ئینتەرڤیوەکە دەدات.

## چاوپێکەوتن بۆ تەلەڤزیۆن

ئەو جۆرەیان لە هەردوو چاوپێکەوتنەکەی دیکە قورسترە، رۆژنامەنووس هەرگیز ناتوانێ بە تەنیا ئەنجامی بدات، پێویستی بە کامێرامان و کارمەندی رووناکی هەیە، ئەگەر راستەخۆش بوو پێویستی بە ئۆتۆمبیلی تایبەت بە گواستنەوەی

پەخشی ڕاستەوخۆ (SNG) دەبێ. ئەگەر چاوپێکەوتن ڕاستەوخۆ بوو دەبێ هەمان کات مۆنتاژ بکرێ، و پێویستی بە زیاتر لە دوو کامێرا دەبێ.

ئەگەر میوانەکە بە زمانێکی بیانی قسەی کرد، چاوپێکەوتنەکە پێویستی بە وەرگێڕ دەبێ، جا وەرگێڕانەکە بەشێوەی تایتل بێ یان دۆبلاژ.

لە چاوپێکەوتنی تەلەڤزیۆنیدا شوێنی دانیشتن و دیکۆر و شێوازی دانیشتن کاریگەری خۆیان هەیە، دەبێ هێندە ڕێك و گونجاو بن و کامێرا وا جووڵەی پێ بکرێت، تەماشاکار تووشی مەلەل نەکات. هەروەها شێوازی پرسیارکردنی ڕۆژنامەنووس و هێما و جووڵەی دەموچاوی وا بێ، سەرنجی وەرگر ڕابکێشێ و هانی بدات تا کۆتایی تەماشای دیمانەکە بکات.

لەبەر ڕۆشنایی هەموو ئەمانە دەکرێ بڵێم:

چاوپێکەوتن ژانرێکی سەربەخۆیە، زۆرکات دەبێتە مادەی سەرەتایی چەندین بابەتی ڕۆژنامەوانی. پرسیارە دانراوەکان دۆسییە سەرەکییەکانی چاوپێکەوتنەکان دیار دەکەن، هەموو دیمانەیەك پێویستی بە زانیاری کۆکردنەوە لەسەر بابەتەکە و ئەو کەسایەتییە هەیە کە ڕۆژنامەنووس میوانداری دەکات، ئامانج و قەبارەکەی، شێوازی داڕشتنی دیار دەکەن، چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان، پێویستیان بە داڕشتن و ڕێکخستنی زمانەوانی هەیە.

# بەشی چوارەم

## نووسینە مەیدانییەکان

## بەدواداچوون، ریپۆرتاژ، پۆرترێت

**بەدواداچوون**

**ریپۆرتاژ**

**لە نێوان بەدواداچوون و ریپۆرتاژدا**

**تەکنیکی نووسینی ریپۆرتاژ**

**پۆرترێت**

وەك لە ناوەکەی دیارە، کارە میدیاییە مەیدانییەکان ئەوانەن کە لە دەرەوەی نووسینگەکان ئەنجام دەدرێن، پێویستە میدیاکار بچێتە شوێنی رووداو یا ئەو دیاردەیەی پەیوەندی بە ئامادەکردنی بابەتەکەی هەیە و بەچاوی خۆی شتەکان ببینێ، تا لەوێوە زانیاری دەربارەیان کۆبکاتەوە.

هەندێك کاری رۆژنامەوانی پێویست دەکات میدیاکار زیاتر لە جارێك بچێتە شوێنی رووداوەکە، یان بچێتە چەند شوێنێك بۆ کرکردنەوەی زۆرترین زانیاری. ئامادەکارانی ئەو جۆرە نووسینە دەبێ توانا و حەوسڵەیەکی فراوانیان هەبێ بۆ دەسنیشانکردنی ئەو زانیارییانەی پەیوەندیان بە بابەتەکانیانەوە هەیە، ئینجا قسەکردن لەگەڵ سەرچاوەکانیان گەر مرۆڤ بوون، هەروەها بە دواداچوون کردن بۆ راستی بەڵگەنامەکان.

نووسینە مەیدانییەکان چەند جۆرێکن، هەندێکمان لە بەشەکانی رابردوو باس کرد وەك، رووماڵکردن، و چاوپێکەوتن، ئەوانەیش کە سروشتێکی سەربەخۆیان هەیە، و ناچنە نێو هەواڵەوە، لەو بەشە تاوتوێ دەکەین، ئەوانیش" (بەدواداچوون، و ریپۆرتاژ، و پۆرترێت Portrait)ن.

ئەو سێ جۆرە وابەستەیی و پەیوەندی بە هێزیان لەگەڵ یەگدی هەیە تا رادەی تێکەڵ بوون بە یەکتری، ئەگەرچی هەریەکەیان تایبەتمەندی و رێسای خۆی هەیە، بەڵام زۆرێك لە رۆژنامەنووسان لە کاتی ئامادەکردنیان، لێکیان جیاناکەنەوە، تێکەڵی یەکتریان دەکەن. بەڵام پرۆفێشناڵ بوون ئەوەمان لێ دەخوازێت جیاکارییان لە نێواندا بکەین و لەکاتی نووسیندا تایبەتمەندییەکانیان رەچاو بکەین.

## بەدواداچوون

میدیای کوردی بە رادەیەکی زۆر تێکەڵی لە نێوان بەدواداچوون و ریپۆرتاژدا دەکات، زۆربەی ئەو بابەتانەی لە ژێر ناوی ریپۆرتاژ دادەندرێن تایبەتمەندییەکانی بەدواداچوونیان بەسەردا زاڵە، بەدواداچوونەکانیش مۆرکی ریپۆرتاژیان تێدا دەبیندرێت.دەتوانم بڵێم ٪٩٥ ئەو بابەتانەی بە ناوی ریپۆرتاژ و بەدواداچوون بڵاودەبنەوە، تێکەڵەیەکن لە هەردوو جۆر.

وەك ئاماژەمان پێدا رەچاوکردنی تایبەتمەندییەکانی ریپۆرتاژ و بەدواداچوون، پەیوەندی بە پرۆفێشناڵ بوونەوە هەیە، بەڵام ئەوەی گرنگە ئامانج و ئەنجامی کارەکەیە، با تێکەڵ کردن هەبێ، بەڵام دەبێ رۆژنامەنووس بزانێ چی دەکات، چۆن هەنگاو دەنێ، ئامانجی ماندوبوونەکەی چییە؟؟ تا دواجار ئەنجامێك ببەخشێ.

بەدواداچوون لە سادەترین مانایدا بریتییە "لەو تێکستەی بەهۆی کارێکی مەیدانییەوە لە دایك دەبێ، تیایدا شیکردنەوە و وەڵامی دروست، بەپشت بەستن بە سەرچاوە و بەڵگەنامەکان، دەربارەی ئەو پرسیارەی رۆژنامەنووس لەبارەی رووداو یان دیاردەیەك دەیوروژێنێ، دەدرێتەوە"[(١)].

بەدواداچوون چەند جۆرێکی هەیە، بە پێی جۆری بابەتەکە ناو دەنرێت، وەك" بەدواداچوونی سیاسی، بەدواداچوونی ئابووری، بەدواداچوونی کۆمەڵایەتی، بەدواداچوونی رۆشنبیری، بەدواداچوونی وەرزشی، بەدواداچوونی هونەری،....تاد.

هەموو بەدواداچوونێك پێویستی بە پلان هەیە، دوای دەسنیشانکردنی بابەتەکە، رۆژنامەنووس پلانەکە دەخاتە واری جێبەجێ کردنەوە، یەکەم هەنگاو دەست دەکات بە کۆکردنەوەی زانیاری و پرسیارکردن لە خەڵکی دەربارەی بابەتەکەی، لێرەوە ئەو بیرۆکەیە گەڵاڵە دەبێ کە لە بەدواداچوونەکەی چارەسەری بۆ دەکات.

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ئەحمەد زەینەدین، ٧٧-٧٨.

بیرۆکە دیاریکراوەکە دەبێ شیاوی باسکردن و چارەسەری بێ، تازەبێ، زۆرترین بنەماکانی بڵاوکردنەوەی تێدا کۆببێتەوە، هەروەها سەرچاوەی زانیاری پێویستیشی هەبێ.

دوای دڵنیا بوون لەمانە، میدیاکار دەست دەکات بە زانیاری وەرگرتن و پرسیارکردن، لەم قۆناخەدا ئەوەی بۆ روون دەبێتەوە پێویستە کێ بدوێنێ، و لە چ شوێنێکیش زانیاری هەیە.

پرسیارکردن دەربارەی بابەتەکە، پەیوەنداری جۆری ئەو کارەیە کە بڕیارە رۆژنامەنووس بەدواداچوونی لە بارەوە بکات، ئەگەر بیرۆکەکە بریتی بوو لە (زیادبوونی رێژەی ئەو کچانەی لە رێستورانتەکان ئیش دەکەن)، لێرەدا راوەرگرتن لە دوو رێستورانتی ناوچە جیاواز بەسە، لەگەڵ گەڕانەوە بۆ ئەرشیف و چاوخشاندن بە چۆنیەتی چارەسەرکردنی ئەو بابەتە ئەگەر لە رابردوودا باس کرابێ. بەڵام ئەگەر بیرۆکەی بەدواداچوونەکە بریتی بوو لە (گەندەڵی لە کەرتی پزیشکی)، ئەوا بابەتەکە پێویستی بە لێکۆڵینەوە و پرسیارکردنی فراوانتر و قوڵتر هەیە.

بۆ نموونە گەر رۆژنامەنووس حەزی کرد بەدواداچوون بۆ سامانی گۆگرد لە کوردستان بکات، پێویستە سەرەتا بزانێ ئەم بابەتە پێشتر باس کراوە یان نا، ئەگەر کراوە چۆن و لە چ روویەکەوە، ئینجا پرسیار لە کەسانی پسپۆر بکات، پاشان ئەو بیرۆکەیە دیار بکات کە بەدوایدا دەچێت، چونکە باسکردن لەو بابەتە چەند لایەنێك لەخۆدەگرێت وەك" یەدەگی نیشتمانی گۆگرد لە کوردستان، و شوێنەکانی، و شێوازی دەرهێنان، و ناردنەدەرەوەی، و فرۆشتنی، هەروەها نرخی لە بازاڕەکان و تێچوونی.

ئەگەر دڵنیا بوو لەوەی پێشتر وەك پێویست تیشکی نەخراوەتە سەر و رای جێگیر بوو لە سەر باسکردنی یەدەگی گۆگرد لە هەرێمی کوردستان، لێرەوە دەتوانێ پلانی کارکردن دابڕێژێ، ئەو پلانە وەك ئاماژەمان پێدا بیرۆکەی بەدواداچوونەکە هەڵدەگرێ کە وەك قیبلەنوما وایە، یارمەتی ئامادەکار دەدات دەسنیشانی کەس و شوێنی ئەو زانیارییانە بکات کە خزمەت بە بابەتەکەی

دەگەیەنن. بەکورتی بوونی بیرۆکەیەکی روون، پرۆسەی کۆکردنەوەی زانیارییەکان، و دارشتنی بابەتەکە ئاسان دەکات.

دوای جێگیربوون لەسەر بیرۆکە، قۆناخی دیاریکردنی تەوەرەکانی بەدواداچوون دێت، هەر لەسەر ئەو ئەساسەش سەرچاوەکانی زانیاری دیاریدەکرێن، و وادەی چاوپێکەوتن لەگەڵ کەسانی پەیوەندداریش جێگیر دەکرێت.

ئەگەر هاتوو بیرۆکەی بابەتەکە باسکردن بوو لە (کەمبوونەوەی بەرهەم هێنانی بەروبوومی کشتوکاڵی لە هەرێمی کوردستان)، یەکەم شت لەو پرسە، وەدەست هێنانی حوکم یان بەڵگەیەکە ئەو بیرۆکەیە پشتڕاست بکاتەوە، رۆژنامەنووس دەبێ بزانێ ئەوەی لە کوێ دەست دەکەوێت. بەڵگەکان بە شکل و شێوەی جیاوازن، هەندێکیان دەرئەنجامی لێکۆڵینەوەی زانستین، هەندێکی دیکەیان داتا و ژمارەی فەرمانگە یان کۆمەڵەیەکی کشتوکاڵین، یان توێژینەوە و شەهادەی پسپۆرێکی ئەو بوارەن، هەروەها بینین و گێڕانەوەی رۆژنامەنووسیش وەك بەڵگەیە، بەڵام دەوڵەمەند کردنی بە داتا و حوکمی پسپۆران، گرنگتر و بە هێزتری دەکات.

رۆژنامەنووس بە پێچەوانەی توێژەری زانستی، دەتوانێ پشت بە قسە و شەهادەی خەڵکی ببەستێ بۆ چەسپاندنی بیرۆکەی بابەتەکەی و موعالەجەکردنی، چونکە میدیا لە رێگەی خستنەڕووی شتێکی تایبەتەوە شتەکان گشتگیر دەکات[1].

بە هەرحاڵ، لە هەر تەوەرێکی بەدواداچوون، ئامادەکار لە خۆی دەپرسێ" دەبێ کێ گونجاو بێ بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە؟ و لە چ شوێنێك زانیاری دروستی

---

[1] پێدانی رەهەندی گشتی بە شتێکی تایبەت، یەك لە بنەماکانی کاری میدیایە، ئەگەر توێژەرێکی زانستی باس لە کەرتی کشتوکاڵ بکات، ناتوانێ تەنها ئیکتیفا بە شەهادەی ئەو کەسانە یان جووتیارانە بکات کە رای وەرگرتوون، چونکە قسەی ئەوان لە رووی زانستییەوە بە سەرچاوە هەژمار ناکرێ، بەڵام میدیاکار بۆی هەیە لە میانی خستنەرووی حاڵ یان رای جوتیارێك رۆشنایی بخاتە سەر دیاردەیەکی کشتوکاڵی، بەڵام گەر بابەتەکەی باسی لە دیاردەی گەندەڵی یا دزی...تاد، کرد، تەنها شەهادە و را وەرگرتن بەس نییە، دەبێ بیرۆکەکەی بە بەڵگە و داتا و دۆکۆمێنت پشت راست بکاتەوە، دەنا لەوانەیە رووبەڕوی لێکۆڵینەوەی یاسایی ببێتەوە.

دەست کەویّ؟ ئەو وەڵامانە چین کە زۆر زەروورن و دەبیّ وەدەستیان بیّنیّ؟ ئایا توانیتم بگەمە شویّنی سەرچاوە پیّویستەکان؟

دوای کۆتا هاتن لە تەوەری یەکەم، رۆژنامەنووس پلانی تەوەری دووەم دادەڕیّژیّ، لە هەر تەوەریّك پرسیارەکانی سەرەوە لە خۆی دەکاتەوە، بۆ نموونە، گەر بڕیاری دا بیرۆکەی بەدواداچوونەکە (کەمبوونەوەی بەرهەم هیّنانی بەروبوومی کشتوکاڵی بوو لە هەریّمی کوردستان)، پیّویستە بپرسیّ ئەو بەروبوومە بۆ لە کەم بوونەوە و پاشەکشە دایە؟ ئەوەی وەڵامی ئەو پرسیارە دەداتەوە دەبیّ مامۆستایەکی پسپۆری ئەو بوارە بیّ، یان بەرپرسیّك لە وەزارەتی کشتوکاڵ، یان بەرپرسی کۆمەڵەیەکی کشتوکاڵی...تاد.

دوای تەوەری هۆکارەکان، لەوانەیە ئامادەکار هەوڵی خستنەڕووی چارەسەری بدات، لیّرەش بە هەمان شیّوە سەرچـــاوەی زانیاری و ئەو کەسە دیاریدەکـــات کە رای وەردەگـــریّت، (بەرووبومی کشتوکاڵی هەریّم لە کەمبوونەوەی بەرچاودایە، بە رای ئیّوە هۆکاری ئەمە چیە؟).

لەوانەیە هەندیّك رۆژنامەنووس تەوەریّکی دیکەش بۆ بەدواداچوونەکەیان ئیزافە بکەن، وەك ئەوەی پرسیار لە ئاسەوارەکانی کەمبوونەوەی بەروبوومی کشتوکاڵی لە هەریّم لەسەر کەرتی کشتوکاڵ و کۆمەڵگە بکەن، لیّرەش وەك تەوەرەکانی پیّشوو، هەمان شیّواز پەیڕە و دەکریّت.

لە راستیدا رۆژنامەنووس خۆی سەر پشکە لەوەی کەی کۆتایی بە بەدواداچوونەکە دیّنیّ، لیّرە چەند ئیعتیبباریّك رۆڵ دەبینیّ، دیارترینیان" ماوەی دەسنیشان کراو بۆ تەواوکردنی بابەتەکە، پانتایی و فەزای تەرخان کراو لە کەناڵەکە بۆ بڵاوکردنەوەی بەدواداچوونەکە، ئەو ئامانج و شویّنەی رۆژنامەنووس و کەناڵەکەی دەیانەویّ پیّی بگەن، هەندیّ جار مەزاجی میدیاکارەکەش، بۆیە لەوانەیە تەنها بە خستنەڕووی هۆکارەکان کۆتایی بە بابەتەکە بیّنیّ، لەوانەشە بەردەوام بیّ تا دەسنیشانکردنی ئاسەوارەکانیش.

- ***بیرۆکە قیبلەنومای بابەتەکەیە، و پلانیش کلیلی کارکردن***

*تەوەری یەکەم: دیاریکردنی بیرۆکە/کەمبوونەوەی بەرهەمی بەروبوومی کشتوکاڵی لە هەرێم/رای چەند جووتیارێك:ئەو کەمبوونەوەیە چۆنە؟ لە چیدا کۆدەبێتەوە؟/سەردانی کۆمەڵەیەکی کشتوکاڵی:راپۆرتی ئەوان لەو بارەیەوە، چاوپێکەوتن لەگەڵ سەرۆکەکەی و سەرۆکی فەرمانگەی کشتوکاڵی لە وەزارەتی کشتوکاڵ.*

*تەوەری دووەم: هۆکارەکان: راپۆرتی کۆمەڵە کشتوکاڵیەکە: خستنە رووی هۆکارە دەسنیشان کراوەکان، سەرۆکی کۆمەڵە: هۆکارەکان چین؟؟/ سەرۆکی فەرمانگەی کشتوکاڵی:هەمان پرسیاری پێشوو/ پسپۆرێك: هەمان پرسیار/*

*تەوەری سێیەم: سەرۆکی کۆمەڵەکە:بەڕای ئێوە چارەسەری چییە؟/ پسپۆرەکە:هەمان پرسیار/ بەڕێوەبەرکەی وەزارەت: هەمان پرسیار.*

*رۆژنامەنووس دەتوانێ ستوونێك تەرخان بکات بۆ دەسنیشان کردنی ئەو کاتانەی کە تیایدا سەردانی شوێن و کەسەکانی کردووە.*

کەواتە پلانی هەڵقوڵاو لە بیرۆکەیەکی روون و ئاشکراوە، کاری ئامادەکار لە هەردوو قۆناخی کۆکردنەوەی زانیاری و دارشتندا ئاسان دەکات، چونکە تەنها شوێنی زانیارییەکان و کەسانی پەیوەنداری بۆ دیار ناکات، بەڵکە ئەو پرسیارانەش کە دەبێ ئاراستەی بەشداربووانی چاوپێکەوتنەکەی بکات، لەگەڵ ئەو کەموکوڕیانەی لەکاتی پرسیاردانانیدا بەسەری پێپەڕیون. بۆ نموونە ئەو پرسیارانەی کە لە بەڕێوەبەری کشتوکاڵی دەکات/رادەی پاشەکشەی بەرهەمی کشتوکاڵی نێوخۆیی لە چ ئاستێك دایە؟ هۆکارەکان چین؟ چارەسەرییەکان چین؟.

لەوانەیە بە یەك دیدار رۆژنامەنووس نەتوانێ زانیاری پێویستی دەست بکەوێت، یان لە کاتی دیدارەکاندا تەوەری نوێی لا دروست ببێ، بۆیە پێویست دەکات جاری دیکەش سەردانی لایەنە پەیوەندارەکان بکات.

ئەگەر بەدواداچوونەکە بۆ tv بوو، ئامادەکار پێویستی بە کامێرامان، و ئەندازیاری دەنگیش هەیە.

بەدواداچوونە پۆلیسییەکان و هەندێك بابەتی دیکە، موعالەجەکردنیان لە رێگەی تەلەڤزیۆنەوە سەرکەوتووترە، بەو پێیەی tv لە ئامرازە (بیستۆکە-بینۆك)ەکانە، هەندێك بابەتیش پێویستی بە موشاهەداتی زیندوو هەیە، تەنها دەنگ یان نووسین بەس نین بۆ نزیك کردنەوەی واقیعەکە لە وەرگر.

پاش قۆناخی کۆکردنەوەی زانیاری و راوەرگرتن و چاوپێکەوتنەکان، قۆناخی نووسین دەست پێدەکات. لە بەدواداچووندا دەقە رۆژنامەوانییەکە بریتییە لە" خستنەڕووی خوێندنەوەی میدیاکار دەربارەی بابەتەکە بە ئسلوبێکی ناڕاستەخۆ، لەرێگەی کۆمەڵێك رستەی لکێنەرەوە، بە پشت بەستن بەو دەرئەنجامانەی پێی گەیشتووە.

دەستەواژە و رستە لکێنەرەکان (ئەوانەی دوو رستە یان مانا بەیەکەوە گرێ دەدەن)، رۆڵی گرنگ لەو شێوە نووسینە دەبینن، چونکە رایەڵە لە نێوان بیروڕاکان دروست دەکەن، و تەوەرەکان بەیەکدییەوە گرێ دەدەن.

ئەو رستانە بە گشتی دوو جۆرن" یەکێکیان: کۆتایی بە مانا و بیرۆکەیەك دەهێنێ و دایدەخات، دووەمیان: دەرگە لەبەردەم بیروڕا یان بیرۆکەیەکی نوێ والا دەکات.

دەمی کرداریش لە بەدواداچووندا بەسیغەی رانەبردووە، هەندێ کردار زۆر دووبارە دەبنەوە وەك (دەڵێت، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، پێدەکەنێت...تاد). لەو بەدواداچوونانەی بۆ رۆژنامە و گۆڤارەکان ئامادە دەکرێن، دەشێ هەندی مەشهەد و هە لچوون بە هۆی ئسلوبی وەسفکردن بۆ خوێنەر بگوازرێنەوە.

ئاسانترین شێوە نووسینی بەدواداچوون ئەو شێوەیە کە هەر تەوەرێك بە جیا، بێ تێکەڵ کردن لەگەڵ ئەوانی دیکە، دادەڕێژێ. لە هەیکەلی نووسینیشدا شێوازی

هەرەمی سەرەوژێرکراو پەیڕەو دەکرێت، واتە بەو زانیاری و بیروڕایانە دەست پێدەکەین کە زۆرترین کۆدەنگیان لەسەرە.

ڕۆژنامەنووس بۆ هەناسەدان بە تێکستەکە، دەتوانێ کۆتایی هەر تەوەرێك بە وەڵامی سەیر و گاڵتەجاری (بێگومان ئەگەر وەڵامی لەو شێوە هەبوو) دابخات، چونکە نووسینی ڕۆژنامەوانی، بەتایبەت (ریپۆرتاژ، و وتار و پۆرترێت...تاد) وەك هەر هونەرێکی دیکە بەشێك ئیحساس لە خۆیدا کۆدەکاتەوە، بۆیە گەر ڕۆژنامەنووس هەستی کرد زانیاری یان بۆچوونێك بە ئاسانی ناگوازرێتەوە، ئاساییە پەنا بۆ ئیحساسی ببات بۆ نزیك کردنەوەی ماناکان بۆ خوێنەر[١].

*پلانی هەڵقوڵاو لە بیرۆکەی روون، کرداری نووسین ئاسانتر دەکات:*

*بە پێی قسەی زۆربەی ئەو کچانەی لە ریستورانت و کافێکان ئیش دەکەن، دەردەکەوێ فاکتەری ئابووری دیارترین پاڵنەری کاکردنیانە لەو شوێنانە"لێرە کاردەکەم تا خوێندنی زانکۆ تەواو بکەم، چونکە ماڵەوە توانای دابین کردنی پارەی خۆێندنیان نییە..."، لانەی تەمەن ٢١ ساڵان کە لە ریستورانتێکی شاری سلێمانی کار دەکات، دەڵێت:زۆر لەو کچانە بە ناچاری دەسبەرداری خوێند بوونە بۆ بەخێوکردنی خێزانەکانیان چونکە هیچ سەرچاوەیەکی دیکەی داراییان نییە، "باوکم مرد و حەوت کچی لە دوای خۆی بەجێهێشت، بۆیە کەوتمە ئیش کردن بۆ پڕکردنەوەی ئەو گرفتە داراییەی بە هۆی مردنی ئەوەوە دروست بوو، لێرە هیچ دەستگایەکی حکومی کۆمەك بەخش نییە بۆ یارمەتی*

(١) ألبرت هستر و واين تو، دليل الصحفي في العالم الثالث، القاهرة، الدار الولية للنشر و التوزيع، ١٩٩٨، ١٧٣.

دانی خێزانی وەك ئێمە، بۆیە باشترین رێگەچارە ئیش کردنە.."

شیرین تەمەنی (٢٨)ساڵە، ئەویش لە ریستورانتێك کار دەکات، ئەو پێی وایە هەندێك لە کچان دوور لە فاکتەری ماددی، تەنها بەهۆی بێزاربوونیان لە دانیشتنی ماڵ و بۆ ناسینی خەڵك، کار لەو شوێنانە دەکەن....

بیرۆکەی سەرەکی ئەو نموونەیەی سەرەوە (کارکردنی کچانە لە ریستورانتەکان)، /تێبینی بکە ئامادەکار لەو تەوەرەدا تەنها باسی لە هۆکارەکان کردووە/ بەڵام دەرگای تێکستەکەی بە کلیلی ئەو هۆکارە کردۆتەوە کە زۆربەی بەشداربووان کۆکن لەسەری.

نووسینی بەدواداچوون تێکەڵەیەکە لە خوێندنەوەی رۆژنامەنووس و دەرئەنجامەکان:

زۆربەی ئەو کچانە هەوڵ دەدەن پەیوەندیان لەگەڵ موشتەریەکانیان تەنها پەیوەندی کارکردن بێ، شەیما (٢٣ ساڵ)لە کافێیەك کار دەکات،فەرمانبەرانی کۆمپانیایەکی نزیك لە کافێکە موشتەری سەرەکین، ئەو بە هۆی دیتنی رۆژانەیان، ناوی زۆربەیان فێربووە و پلەی وەزیفیشیان دەزانێ"کە دێنە ئێرە قسەیان لەگەڵ دەکەم، پرسیاریان دەربارەی کارەکانیان لێدەکەم، ئەوانیش بە هەمان شێوە، بەڵام پەیوەندیم لەگەڵیان، هەر لە چوارچێوەی ئێرەیە...".

بەگشتی ئەو کچە کارکەرانە حەز ناکەن مووچەی مانگانەیان ئاشکرا بکەن کە لە نێوان ٤٠٠-٨٠٠

*دۆلارە لە مانگێکدا، بەڵام بەهۆی بەخشیشەوە ئەو رادەیە تێپەڕ دەکات. لێکۆڵینەوەیەکی فێرخوازانی پەیمانگەی تەکنیکی سلێمانی دەڵێت"هەندێك مانگ مووچەی ئەو کچانە دەگاتە١٠٠٠ دۆلار بەهۆی ئەو بەخشیشە زۆرەی رۆژانە وەری دەگرن".*

*ئێستا لە ریستورانت و کافێکانی شارەکە بە روونی زۆربوونی ژمارەی کچە کارکەرەکان دەبیندرێت، بە رادەیەك ریستورانتە ئاساییەکانیش پەنا بۆ خزمەتگوزاری کچان دەبەن، بابەتەکە وەك مۆدی لێهاتووە، هەر رێستورانت و کافێیەکیش رەنگ و ستایلی تایبەت بەخۆی هەیە، بەڵام ئەوەی ئەمڕۆ باوە ستایلی کراس و تەنورەی کورتە...*

تێبینی بکە، نووسەر لە خستنەڕووی بابەتەکە، لە بڕگەی یەکەم پشتی بە قسەی وەرگیرا و بەستووە و لە ناو دوو کەوانەی داناوە، بەڵام لە بڕگەی دووەم بە دەرئەنجامەکان، لە بڕگەی سێیەمیشدا نووسینەکەی لە رێگەی بینین و خوێندنەوەی تایبەتی خۆی بە هێز کردووە. تێبینی ئەوەش بکە چەند وردە لە پابەند بوون بە مەسەلەی خاڵبەندی.

- ***رستە لکێنەرەکان یارمەتیت دەدەن چۆن کۆتایی بە تەوەرێك بێنی، و بچیتە نێو تەوەرێکی دیکە:***
- ***مەرج نییە هەموو کات پێداویستی ماددی*** *پەیوەندی بە خوێندن و باری ئابووری خێزانەوە هەبێ"بەڵکە بە هەندێك خەرجی دیکەوە کە خێزان بۆ کچەکەی دابین ناکات" وەك نارین (٢٣ساڵ) ئاماژەی پێدەدات.....*

• **ئەگەرچی ئەمڕۆ زۆر لە کچان لایان ئاساییە لە ڕێستورانتەکان کار بکەن، کەچی بە پێچەوانەوە** *خێزانەکانیان بەم کارە ڕازی نین چەند بارودۆخی ئابووریشیان خراپ بێ"خێزانەکەم زۆر بەتووندی بەرامبەر بە کارکردنم لەو ریستورانتە وەستان، بەلاّم دواجار بە ئسلوبی خۆم توانیم قەناعەتیان پێبێنم" دالیا بێ ئاماژەدان بەو ئسلوبە بەردەوام دەبێ و دەڵێت:......*

• **تێبینی بکە چۆن ئامادەکار بەهۆی ڕستە لکێنەرەکان، لە** *تەوەری /هۆکارەکان/دەچێتە سەر تەوەری /هەڵوێستی خێزان/.*

**ئیقتیباسی ڕاستەوخۆ، تێبینییەکانی نووسەر، بە کارهێنانی هەندێك بکەر، دەستەواژی باو، و بایەخدان بە خاڵبەندی، ماناکان قوڵتردەکەن و ڕستە و پەرەگرافەکان جوانتر نیشان دەدەن:**

*کرێکارەکان زۆر توڕەن لە هەڵوێست و لێدوانی بەرپرسانی سەندیکاکەیان" دەبێ دەرسێکیان بدەین هەرگیز لە بیری نەکەن" ، یەك لە کرێکارەکان وادەڵێت*

*دانا یەك لەو کرێکارە توڕانەیە، ئەو لە کارگەی دروست کردنی ئاسن کار دەکات، زۆر بەروونی گەڤ لە بەرپرسانی سەندیکاکەی دەکات:"دەرسێکیان دەدەین قەت لە بیری نەکەن" .*

*وادیارە ئەمجارە کرێکارەکان دەستەوەستان ناوەستن، لەم بارەیەوە سەرۆکی پێشووی سەندیکای کرێکاران*

*دەڵێت:"چەند جارێکی دیکەش هێرشیان کردۆتە سەر بارەگای سەندیکا و ...."*
*"دەرسێکیان دەدەین قەت لەبیری نەکەن"یەك لە کرێکارەکان بە توونلدی لە مێزەکەی بەردەمی دەدا و وایدەگوت..*

لە بڕگەی یەکەمدا ئاگاداری بە کارهێنانی ئیقتیباس و تێبینی رۆژنامەنووس بکە کە چۆن هەردووکیان تەئکید لە سەر یەك مانا دەکەن، ئەویش هەڵوێستی کرێکارە تورەکانە.

لە بڕگەی دووەمدا تێبینییەکان و ئیقتیباس تێکەڵ بە یەکتری دەکرێن، خاڵبەندیش بە شێوەیەکی فراوان دادەندرێت.

لە بڕگەی سێیەم و چوارەمیشدا ئامادەکار لە پێناو نزیك کردنەوەی ماناکە لە زهنی وەرگر، چەند دەستەواژەیەکی وەسفی بەکار دێنێ، وەك (بە دەستی لە مێزەکەی دا، بە توڕەیی...تاد). لە بەدواداچوونی تەلەڤزیۆنی پێویستیمان بە وەسفکردن نییە، وێنەکان خۆیان ئەو حاڵەتانە دەگوازنەوە.

تێبینی ئەوەش بکە هەر چوار بڕگەکە بە شێوازێك نووسراون سەرنجی وەرگر بۆ داهاتوو و نووسینی دواتر رادەکێشن، لێرەدا بەکارهێنانی بکەری سیغەی رانەبردوو،یارمەتی نووسەر دەدات.

دوای کۆتایی هاتن لە نووسینی تەوەرکان، بەدواداچوونەکە لە کۆتایی نزیك دەبێتەوە، لێرەدا پێویستە بە چەند دێڕێك دوماهی بە قسەکانت بێنی و نووسینەکە قفلْ بدەی، نووسینی ئەو چەند دێڕە شێواز و رێسایەکی دیاریکراوی نییە، تەنها ئەوە نەبێ هەوڵ بدە بە ئسلوبێکی سەرنج راکێش بێ، گوزارشت لەو ئەنجامانە بکات کە پێی گەیشتووی.

ئینجا دەست بە دەرهێنانی مانشێتە سەرەکی و لاوەکییەکان بکە، با مانشێتی سەرەکی گوزارشت لە گرنگترین زانیاری بەدواداچوونەکە بکات.

## ریپۆرتاژ

ریپۆرتاژ هونەرێکی رۆژنامەنووسی تایبەتە، دەچێتە خانەی ژانرە میدیاییە مەیدانییەکان، رووداو و شوێن و دیاردەکان لە رێگەی وەسفەوە موعالەجە دەکات، بە هۆی وشە یان دەنگ، یان دەنگ و وێنەوە، وەرگر بۆ چەقی مەشهەد و بابەتەکە دەگوازێتەوە.

ئامادەکاری ریپۆرتاژ بە ریپۆرتەر ((REPORTER ناو دەبردرێت، ئەو وەك ئەو گەشتیارەیە کە لە سەفەرێك گەڕاوەتەوە، وهەرچی بینیووە، و بۆن کردووە، و خواردووە، و بیستووە، و گویّ لێبووە...تاد، بۆ دەوروبەرەکەی دەگێڕێتەوە. بۆیە چەند لێزان و بە دیقەت بیّ لە وەسف کردن، ئەوەندە زیاتر دەتوانیّ وێنە و رووداوەکان لە زهنی وەرگر نزیك بکاتەوە.

هەندێك پێیان وایە بۆچوون و تێڕوانینی شەخسی رۆژنامەنووس لە ریپۆرتاژدا زۆر زاڵە، بە بڕوای من هیچ ژانرێکی رۆژنامەنووسی بە هەواڵیشەوە بەدەر نییە لە ئینتیباعی کەسی میدیاکار، ئەو ئینتیباعە بە شێوەیەك لە شێوەکان دەچێتە نێو دەقە رۆژنامەوانییەکان، چونکە شێوازی ئاڕاستەکردنی بابەتەکان، و هەڵبژاردنی جۆری وێنە و شەهادە و دەرئەنجام و داتاکان، حەتمەن دەکەونە ژێرباری تێڕوانی کەسیی میدیاکار.

تەلەڤزیۆن بەهۆی باشیی و تواناکانی وێنەوە، لە هەر ئامرازێکی دیکەی راگەیاندن گونجاوترە بۆ ریپۆرتاژ، لە ریپۆرتاژی تەلەڤزیۆنیدا، ریپۆرتەر ماندووبوونێکی ئەو تۆ نابینێت بەو پێیەی ئەرکی وەسف کردنی شوێن و رووداوەکانی لە کۆڵ دەبێتەوە.

بابەتەکانی ریپۆرتاژ هەمەجۆرن، وەك گواستنەوەی کەش و هەوای ژیانی رۆژانەی خەڵك لە گەڕەکێك، یان شارێك، یان وڵاتێك، یان وێناکردنی ژیانی خەڵکی سڤیل لە کاتی شەڕدا، یان بارودۆخیان دوای رووداني کارەساتێکی سروشتی وەك بومەلەرزە و لافاو و...تاد.

هەروەها دەکرێ بابەتی ریپۆرتاژ گواستنەوەی دیاردەیەك بێ لە ناوچەیەکی دیاریکراو، وەك دیاردەی تاتو، ئیمۆ، خەتەنەکردن...تاد. هەروەها دەشبێ خستنەڕووی رووداوێك بێ، دەشبێ تیشکخستنە سەر شوێنێکی دیاریکراویش بێ، وەك شار، قەڵا، ناوچەیەکی شوێنەواری....تاد.

## لە نێوان بەدواداچوون و ریپۆرتاژدا

جیاوازی سەرەکی نێوان بەدواداچوون و ریپۆرتاژ لەوەدایە، یەکەمیان تاوتوێی حەقیقەتێکی رووت دەکات، جا سیاسی بێ یان کۆمەڵایەتی و ئابووری و رۆشنبیری و هونەری و وەرزشی و..تاد، بەڵام ریپۆرتاژ کردارێکی وەسفیە، کەش و هەوای، شوێن یان رووداو یان دیاردەکان وێنا دەکات، و وەك خۆیان دەیانگوازێتەوە.

ئەگەر بیرۆکەی بەدواداچوون ئەو حەقیقەتە بێ کە دەیخاتەڕوو، ئەوا بیرۆکە لە ریپۆرتاژ، تێڕوانین و بینینی میدیا کارە، ریپۆرتەر بۆ ئەوەی بگاتە ئەو تێڕوانینە، وەك ئاماژەمان پێدا دەبێ رۆڵی ئەو گەشتیارە ببینێ کە دەچێتە شوێنێك و حەز لە دیتن و زانینی هەموو شتێك دەربارەی شوێنەکە دەکات، لەوانەیە پێویست بکات چەند جارێك سەردانی شوێنەکە یان شوێنی رووداو یان دیاردەکە بکات، لەگەڵ خەڵکەکە بژیەت، لە خواردن و عادات و شێوازی ژیان و جل و بەرگ و ...تاد شارەزا بێت، هەروەها قسەیان لەگەڵ بکا و گوێیان لێ رابگرێ، و تێبینییەکان لای خۆی تۆمار بکات، تا تێڕوانینێکی کامڵی لا گەڵاڵە دەبێ، و دەتوانێ بە هۆیەوە بابەتێکی رۆژنامەوانی بخولقێنێ.

ئەگەر ئامادەکاری بەدواداچوون بایەخ بە هۆکار و ئاسەوار و ئەنجام و چارەسەرییەکان بدات، ئەوا ریپۆرتەری ریپۆرتاژ بایەخی لەسەر چۆنیەتی بەرجەستەکردنی ئەتمۆنسفێری ئەو حاڵەتە، یان شوێن و رووداوەیە کە دەیگوازێتەوە.

بۆ نموونە گەر دانیشتوانی گەڕەکێك بە هۆی جێبەجێ کردنی پرۆژەیەکەوە رووبەڕووی مەرگەسات و ژیانێکی ناخۆش هاتن، ریپۆرتاژ لە رێگەی قسەی خەڵکەکە و بینینەکانی ریپۆرتەرەوە، ناخۆشیەکانی خەڵکەکە بۆ وەرگر وێنا

دەکات، لەبەر ئەوەی هۆکاری تێکچوونی ژیانی خەڵکەکە ئەنجامدانی پڕۆژەکەیە، بۆیە لێرەدا باس کردن لە چارەسەری هیچ سوودی نییە، چونکە ئەگەر وانیە دەبووایە لایەنی پەیوەندار کێشەکەی چارەسەر کردبا، یان هەر لە سەرەتاوە پڕۆژەکەی ئەنجام نەدابا.

ئەگەر بەدواداچوون بەدوای پسپۆڕێك بگەڕێت تا راو و بۆچوونی دەربارەی هۆکار و ئاسەوارەکانی دیاردەیەك بگوازێتەوە، ئەوا ریپۆرتاژ تەنها بایەخ بە قسە و بۆچوونی خەڵکەکە دەدا، لە زاری ئەوانەوە لایەنی بەرپرسیار و ئاسەوار، و رێگە چارەکان، دیار دەکات.[1].

سەرباری هەموو ئەمانە، هەندێك جار تەنها داوە موویەکی باریك، بەدواداچوون و ریپۆرتاژ لە یەگدی جیا دەکاتەوە، هەروەها زۆر جار تێکەڵکردن لە نێوان ریپۆرتاژ و رووماڵ کردنیش روودەدات. لە هەموو حاڵەتەکاندا ئەوەی گرنگە بەرچاو روونی میدیاکارە بۆ ئەو بابەتەی ئامادەی بکات، پێویستە بزانێ ئامانج لەو ماندوبوونەی چییە، رۆژنامەنووسی بە ئەزموون دەزانێ چ بابەتێك بۆ ریپۆرتاژ دەشێ، و چیش بۆ بەدواداچوون.

---

(١) نبيل راغب: فن التحرير الصحفي، القاهرة، دار غريب، ٢٠٠٥، ٤٧.

## تەكنیكی نووسینی ریپۆرتاژ

ریپۆرتاژیش وەك ژانرە رۆژنامەوانییەكانی دیكە بە چەند قۆناخێكی ئامادەكردندا دەڕوات تا شیاوی بڵاوكردنەوە دەبیٚ، یەكەمین قۆناخ گەڵاڵەبوونی بیرۆكەیە، ئینجا پلانی ئامادەكردن، دواجار داڕشتنی.

پلان و داڕشتن لە ریپۆرتاژدا هەمان پلان و شێوە نووسینی بەدواداچوونە، پلانی ریپۆرتاژ وابەستەی جۆری بابەتەكەیە، ئەگەر ریپۆرتەرێك ماوەیەك لە شوێنێك ژیابێت پلانی كاری جیاوازە لەگەڵ ئەو ریپۆرتەرەی تەنها بۆ ئامادەكردنی ریپۆرتاژەكە سەردانی ئەو شوێنە دەكات.هەروەها گەر لەو شوێنە رووداوێك یان دیاردەیەك رووبدات، هەردوو ریپۆرتەرەكەی پێشوو بچنەوە هەمان شوێن بۆ گواستنەوەی ئاسەوار و شێوە ژیانی دانیشتوانەكەی دوای رووداوەكە، هەمدیس پلانی كار و سەرنج و تێبینییەكانیان لەگەڵ یەكتری جیاواز دەبیٚ، لەوانەیە هەر یەكەیان بە پێی ئەزموونیان لە بابەتەكە، بایەخ بە تەوەرێك لە تەوەرەكانی ریپۆرتاژەكە بدات.

- ***درێژدادڕی لە وەسف كردنی رووداوەكان، وادەكات وەرگر بە ئاسانی لە بیریان نەكات:***

*هۆڵەكە زۆر قەرەباڵغ بوو، دەنگە دەنگ و ژاوەژاو لە هەموو لایەكەوە دەبیسترا، لە ناكاو پێشكەشكاری گردبوونەوەكە بە دەنگێكی بەرزتر لە ژاوەژاوی جەماوەر، ناوی سەرۆكی هێنا، بە ناوهێنانی سەرۆك هۆڵەكە بێدەنگ بوو، ئامادەبووان هەموویان نیگایان رووە و پێشكەشكارەكە رۆیشت، دوای ئەو بیٚ دەنگییە، جەماوەر دەستی بە هوتاف و هات و هاوار كرد....*

• **لەو نموونەیەدا تێبینی بکە رپیۆرتەر چۆن درێژدادڕی دەکات بە مەبەستی راکێشانی سەرنجی وەرگر بۆ ناوی سەرۆك.**

*راکێشانی هەستەوەرەکانی وەرگر بۆ تەرکیز کردن لە سەر دیمەنێکی دیاریکراو:*

*رووبەری ژوورەکە یەك مەتر و نیو چوارگۆشە بوو، تاریك بوو، پەنجەرەیەکی بچووك لە سەرەوە هەبوو، ئەو ژوورە شوێنی نووستن و نان خواردن و دەست بەئاوگەیاندنم بوو، بۆنێکی زۆر ناخۆشی هەبوو، زۆر جار لەژێر دەرگاکەوە بۆ ئازاردانم ئاویان دەکردە ژێرم،هەر لە ژێر دەرگاکەوە لە ٢٤ کاژێردا سەمونێك و کەمێك نیسکیان پێدەدام..... (ئەمە قسەی زیندانییەکی سیاسی سەردەمی بەعسە)ئەو زیاتر بەردەوام بوو، و دەڵێت:....*

• **تێبینی بکە رپیۆرتەر لە رێگەی وەسفکردنی ژیانی زیندانییەکە لە زینداندا، هەوڵی داوە هەستەوەری بینین و بیستن و بۆن کردنی وەرگر بۆ دیمەنەکە رابکێشێ.**

• **بەکارهێنانی زمانی بازاڕ ئەویش هۆکارێکە بۆ نزیك کردنەوەی وەرگر لە رووداوەکان:**

*((بزانە ئەو هات و هاوارەیان هەموو لۆ کورسی پەرلەمان بوو، کە گەیشتنە کورسیەکە، خەویان لێکەت، دەنا مەعقولە گێیان لەو هەرا و دەنگە دەنگەی مە نەبی..)) ئەمە قسەی یەك لە خۆنیشاندەرانی ئەمڕۆی گردنبوونەوەکەی بەردەم پەرلەمان بوو کە بە چرپەوە بە هاوڕێکەی تەنیشتی دەگووت.*

تێبینی بکە ریپۆرتەر بە ئەنقەست زمانی خۆنیشاندەرانی بەکار هێناوە بەمەبەستی پێدانی رەهەندی واقیعی بە باتەکەی و نزیك کردنەوەی لە زهنی خوێنەر.

## پۆرترێت (Portrait)

پۆرترێت (Portrait)، وشەیەکی فەرەنسیە، مامۆستا جەمال عەبدول لە فەرهەنگە ئیعلامییەکەی بە" پێنووسە وێنە=وەسف: وێنەی کێشراوی کەسێکە، ئاسایی دەموچاوی دەردەکەوێت"[(١)]، ناساندوویەتی.واتە لە رووی دەستەواژەوە لە زمانی کوردی، مانای وێنەی شەخسی کەسێك دەگەیەنێت.

بەڵام لە میدیادا، ئەو بابەتە رۆژنامەوانییەیە کە بیرۆکەیەك دەربارەی ئەزموونی ژیانی کەسێك بە وەرگر دەدات.

پۆرترێت بایەخ بەو کەسانە دەدات کە دەکرێ ژیان و ئەزموونیان بکرێتە نمونەیەك بۆ جەماوەر، واتە خەڵك وەك سیمبولی خۆیان تەماشایان بکەن و سوود لە تەجرەبەیان وەربگرن. کەواتە ئەزموونی هەموو کەسێك شیاوی پۆرترێت نییە، ئەو کەسەی وەك زۆربەی خەڵك، رۆژانە دەچێتە کارکردن و ئێوارانیش دەگەڕێتەوە، هەرگیز ژیانی ناکرێتە پۆرترێتی رۆژنامەوانی و نموونە بۆ خەڵك، چونکە ئەو وەك هەموو جەماوەر کارێکی ئاسایی دەکات و جێبایەخی کۆمەڵگە نییە. کەواتە قارەمانانی پۆرترێت کەسایەتییە ناباو و بەرپرس و ئەستێرە ناودارەکانی بوارە جیاجیاکانی ژیانن.

پۆرترێت لە رۆژنامەگەریدا پشت بە بەدواداچوون، و ریپۆرتاژ دەبەستێ، لە هەریەکەیان شتێك وەردەگرێت، دەکرێ رۆژنامەنووسی پۆرترێتست بیرۆکەکەی لە سەر مەشهەدێك یان راستییەك بونیاد بنێ. لەوانەیە پۆرترێتی هەندێك کەسایەتی

---

(١) جەمال عەبدول: فەرهەنگی راگەیاندن، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٦، ٥٠٤ .

پێویستی بە هەردوو توخم، دیمەنێك، و راستییەك هەبێ، بە گشتی دەتوانین سێ جۆرە پۆرترێت دیار بکەین[1]:

**یەکەم: پۆرترێتی سادە:** ئەوەیان هاوشێوەی ئەو ژیاننامە (پرۆفایل)ە سادەیە کە یەکێك دەربارەی تەمەن و پلەی خوێندن و کار و ئەزموونی ئامادەی دەکات، وێستگە سەرەکییەکانی ژیانی تیایدا دەناسێنێ، ئەم شێوەیە بۆ کار و وەزیفە پەیداکردن و چاوپێکەوتنەکانی هەلی کار بەکاردێت.

**دووەم: پۆرترێتە ریپۆرتاژ:** ئەو جۆرەیان بۆ ناساندی تایبەتمەندییە کەسییەکانی، ئەستێرە و ناوداران و کە سانی ناباو، بەکاردێت، تیایدا شێوەی ژیانی رۆژانەیان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیان و مەزاج، و عادات، و خۆزگە و ئارەزووەکانیان وێنا دەکرێت، واتە وێنەیەك لە ژیانی تایبەتی ئەستێرەکان بە جەماوەر دەگەیەنێ.

**سێیەم: پۆرترێتە بەدواداچوون:** ئەو شێوەیەشیان هەڵوێست و بیرکدنەوە و ئایدیا و تێڕوانینی کەسانی خاوەن نفوز و سەرنج راکێش، لە رێگەی خوێندنەوەی مێژووی ژیانیان و کۆکردنەوەی بۆچوون و شەهادەی خەڵکی دەربارەیان، دەنەخشێنێ. واتە بایەخ بە پێشکەش کردنی وێنەیەك لەبارەی بیرکردنەوە و ئایدیای کەسانی ناودار دەدات، نەك مەزاج و خۆزگە و ژیانی ئاسایی رۆژانەیان.

ئیش کردن لەسەر پۆرترێتە ریپۆرتاژ و بەدواداچوون هەمان هەنگاوەکانی ریپۆرتاژ و بەدواداچوونی پێویستە، تەنها ئەوە نەبێ گشت تەوەرەکانیان باس لە یك کەس دەکەن، یان لە بازنەی یەك کەسدا دەخولێتەوە. لە پۆرترێتە ریپۆرتاژ، رۆژنامەنووس تەرکیز لەسەر کەسایەتی یەك کەس دەکات، تێبینی جووڵە و سیفات و شێوازی قسەکردن و ژیان و ئەو رەنگ و بۆن و ئۆتۆمبیلەی حەزی لێدەکات، بەڵام لە پۆرترێتە بەدواداچووندا، لێکۆڵینەوەی دەربارەی ئەو دۆسیە و بوارانەیە کە کاری تێدا کردووە، لەگەڵ شێوازی کارکردنی، و بۆچوونی هاوکارانی دەربارەی.

لە پۆرترێتدا تەنها سادەکەی نەبێ، پێویستە رۆژنامەنووس زیاتر لە جارێك چاوی بە میوانەکە و هاوکار و کەسە نزیك و کاریگەرەکان لەسەری، بکەوێت، هەروەها چەندین جاریش بچێتە ئەو شوێنانەی رۆژانە ئەو کەسە سەردانی دەکات.

---

(١) عبدالخالق محمد علي، فن التحرير الصحفي، دار المحجة البيضاء، بيروت، ٢٠١٠، ٩٢-٩٣.

شوێنی ئەنجامدانی پۆرترێت گرنگی خۆی هەیە، واباشە پۆرترێتست هەوڵ بدات شوێنەکە لەگەڵ سایکۆی میوانەکەی گونجاو بێ، چونکە ئاسوودەبوون لە کاتی چاوپێکەوتندا هانی میوانەکە دەدات عەفەویانە وەڵامی پرسیارەکان بداتەوە.

واباشە ئەو کەسانەی تەجرەبەی پێشتریان لەگەڵ میدیا و چاوپێکەوتن هەیە، لەو شوێنانە چاوپێکەوتنیان لەگەڵ ساز بدرێ کە نامۆ و نا مەئلوفن لە لایان، بەڵام ئەوانەی تەجرەبەی پێشوویان نییە، با خۆیان سەرپشك بکرێن لە دیاریکردنی شوێنەکە، چونکە ئەمە وادەکات لە رەهبە و دڵەڕاوکێی کامێرا و ریکۆردەر رزگاریان ببێ.

هەرگیز لە کاتی قسەکردنی میوانەکەت وا نیشان مەدە تێبینی و سەرەدێڕ دەربارەی قسەکانی دەنووسیت، چونکە لەوانەیە جۆرێك لە نارِحەتی بۆ دروست بکا و کار بکاتە سەر دەرنەبڕینی وەڵامەکان بە شێوەیەکی عەفەویانە.

بە پشت بەستن بە هەموو ئەوانە، دەتوانین بڵێین" پۆرترێتە بەدواداچوون راستی کەسایەتی کەسێك بە دیار دەخات، بەڵام پۆرترێتە ریپۆرتاژ تێڕوانین، یان ئینتیباعێك دەربارەی پێشکەش دەکات. بە واتایەکی دیکە، گەر یەکەمیان ئەوە دەربخات ئایا کەسایەتییەکە سادە و بەریئە یان دڵ رەق و ئاڵۆز، ئەوا دووەمیان دەتوانێ وێنەیەکی وا جوان یان قێزەونی بۆ بنەخشێنێ کە جەماوەر رقی لێببێتەوە یان خۆشی بوێت.

- ***پۆرترێتی سادە، کەسایەتی مرۆڤەکان دەناسێنێ:***
- ***ساڵی ١٩٦٥ لە هەولێر لە دایك بووە، هەڵگری بڕوانامەی*** *بەکالۆریۆسە لە دەروونزانی، پێنج ساڵ وەك توێژەر لە وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی کاری کردووە، شەش کتێبی چاپکراوی دەربارەی دەروونزانی و کۆمەڵگە هەیە، ئێستا راوێژکاری وەزیری......*

- ***جۆری پرۆترێت شێوەی پلانەکەی دیاردەکات:***
- ***پۆرترێتە بەدواداچوون، هەمان پلانی ئامادەکردنی بەدواداچوونی پێویستە.***
- ***پۆرترێتە ریپۆرتاژ، هەمان پلانی ئامادەکردنی ریپۆرتاژی گەرەکە.***

قۆناخەکانی ئامادەکردنی پۆرترێت بە گەڵاڵەبوونی بیرۆکە دەست پێدەکات، ئینجا پلاندانان و دیاریکردنی ئەو کەسانەی دیداریان لەگەڵ دەکرێ، هەروەها ئەو شوێنانەی پێویستە سەردان بکرێن، لەگەڵ دەسنیشان کردنی سەرچاوەکانی زانیاری، و پرسیارەکان.

- ***فلان زۆر حەز لە خواردنی ماسی دەکات، ئەو بە*** *پێکەنینەوە دەڵێت:" لە باوکمەوە ئەوەم بۆ ماوەتەوە، رۆژانە ماسی دەخۆم"، بەڵام پێدەچێ مەسەلەکە لەوە قوڵتر بێت، پەیوەندی بە گۆڕانی شێوەی خواردن و ژیانی هەبێ کە ماوەی ١٥ ساڵە لە شارێکی سەر دەریا لە کەنەدا بەسەری بردووە...*

تێبینی بکە پۆرترێتست بکەری رانەبردوو (دەڵێت، دەخۆم،..)ی بەکارهێناوە، هەروەها هەوڵیداوە هەستەوەری بیستنی وەرگر بوروژێنێ (بەپێکەنینەوە..).

بە پشت بەستن بە هەموو ئەوانە دەتوانین بڵێین:

کارە رۆژنامەوانییە مەیدانییەکان پێویستیان بە گەڕان و سوڕان و بەسەرکردنەوەی شوێنی رووداو و دیاردەکان هەیە. ریپۆرتاژ کار لەسەر هەستەوەرەکانی وەرگر دەکات و بینین و تێڕوانینەکانی رۆژنامەوان دەگوازێتەوە. بەدواداچوونیش راستییەك دەخاتەڕوو و بە دوای هۆکار و ئاسەوار و چارەسەریدا دەگەڕێ. پۆرترێتیش لە رێگەی ریپۆتاژ و بەدواداچوونەوە، وێنەی کەسایەتی، یان ئەستێرەیەکی دیار دەنەخشێنێ

# بەشی پێنجەم

## نووسینە مەکتەبییەکان (نووسینگەیی)

وتاری رۆژنامەنووسی

هەیکەلی نووسینی وتار

رەخنەی ئەدەبی و هونەری

نووسینە مەکتەبییە میدیاییەکان، بە پێچەوانەی نووسینە مەیدانییەکان، پێویستی بە گەڕان، و بەدواداچوون، و چاوپێکەوتن نییە، رۆژنامەنووس لە نووسینگەکەی خۆی، لەسەر مێز و کورسی، یان لە ماڵەوە، دەینووسێت.

ئەم جۆرە نووسینە پشت بە ئەزموون و توانای زمانەوانی میدیاکار دەبەستێ، وتار، و رەخنەکان ئەوانە دەیانووسن کە خودان ئەزموونی دوور و درێژن لە بواری رۆژنامەگەری.

ئەزموونی کار، و موتابەعەی بەردەوام، (جا لە رێگەی خوێندنەوە بێ، یان گوێگرتن، و تەماشاکردنەوە)، توانای شرۆڤە و پێشبینی بە رۆژنامەنووس دەبەخشێ، هەروەها دەیکاتە خودان ئسلوبێکی زمانەوانی تایبەتیش لە نووسیندا، ئەوانەی قەڵەم دەگرنە دەست بۆ نووسینی وتارێك، یان خوێندنەوەیەکی رەخنەیی، دەبێ ئەو سیفەت، و تایبەتمەندیانەیان تێدابێ، وتار نووسین کاری پەیامنێر و ریپۆرتەر و پۆرتریتست نییە، هەروەك چۆن بەدواداچوونی هەواڵ، و ریپۆرتاژ ئامادەکردن کاری وتارنووس نین.

بەداخەوە لە میدیای کوردی تێکەڵی و پێکەڵی لە نێوان هەموو ئەوانەدا دەکرێت، پەیامنێر، وتارنووس و هەواڵ نووس و هەموو شتێکە، بە پێچەوانەوەش، بۆیە زۆرێك لەو وتار و خوێندنەوە رەخنەییانەی لە رۆژنامە و گۆڤارەکان بڵاودەبنەوە هیچ مواسەفات، و بنەمای وتارنووسینیان تێدا نییە، یان لە رووی زمانەوانییەوە ئەوەندە لاوازن دەچنە خانەی ئینشاوە، یانیش هیچ بیرۆکە، و شرۆڤە، و پێشبینییەکیان تێدا نییە کە مەعریفە و ئیزافەیەکی نوێ پێشکەش بە خوێنەر بکات.

بە هەرحاڵ، ئێمە لەو بەشەدا تیشك دەخەینە سەر شێواز و تەکنیکی نووسینی وتار، و خوێندنەوە ئەدەبی و هونەرییەکان، کە ژانری سەرەکی نووسینی مەکتەبین.

## وتاری رۆژنامەوانی

وتاری رۆژنامەوانی دەقێکە گوزارشت لە بیرۆبۆچوونی خاوەنەکەی دەکات، وەك ژانرە رۆژنامەوانییەکانی دیکە بیرۆکەکەی پشت بە بینین، و تێبینییەکانی نووسەر دەبەستێت. یان" ئەو تێکستەیە کە لە بلاوکراوەیەکی دیارکراو بلاودەبێتەوە، تیایدا نووسەر بە گوزارشت کردن لە بیروبۆچوونی خۆی یان بلاوکراوەکەی، رووداوێکی هەنوکەیی، یان دیاردەیەك، بە زمانێکی سادە و رەوان، دەخاتە بەر باس و شرۆڤە کردن، بە ئامانجی پێراگەیاندن و بەرچاو روون کردنی خوێنەر بۆ ئەو رووداو، و پرســـــانەی لە دەوروبەری روودەدەن."[1].

وتاری رۆژنامەنووسی سێ جۆری سەرەکی هەیە، ئەوانیش:[2]

**یەکەم: سەروتار:** وتاری سەرەکی رۆژنامەیە، گوزارشتە لە سیاسەتی رۆژنامەکە، یان ئەو لایەنەی تەمویلی دەکات. کورت، و راستەوخۆیە، لە رووی دارشتنەوە ئسلوبێکی تایبەتی هەیە، نووسەر بۆ ئیقناع کردنی خوێنەر بە بیرۆکەی وتارەکەی، پشت بە بەلگە و شرۆڤەی مەنتیقی دەبەستێت، بە گشتی لەسەر شێوازی هەرەمی ئاسایی دەنووسرێت.

**دووەم: ستوونی رۆژنامەوانی:** ئەو وتارەیە لە شوێنێکی دیاریکراوی رۆژنامە و لە زەمەنێکی دیارکراودا بلاودەبێتەوە، رۆژنامەکە بە یەکێك لە گەورە نووسەرانی دەسپێرێت، نووسەر بە هۆیەوە گوزارشت لە بیروبۆچوونەکانی دەکات دەربارەی دیاردە و رووداوە گەرموگورەکان، بە ئسلوبێکی سادە و سەرنج راکێش، هاوشێوەی سەروتار، هەیکەلی بە شێوازی هەرەمی ئاسایی دادەرێژرێت.

**سێیەم: وتاری شرۆڤەیی:** وتارێکە شرۆڤە و تەفسیری قوولێ بۆ ئەو رووداو و بابەت و پرسانە دەکات، کە جێبایەخی رای گشتین، نووسەر بەلگەنامە و رووداوە مێژووییەکان وەك ئامرازێك بۆ پشت راستکردنەوەی بیر و راکانی، و قەناعەت

(١) کتێبێکی پێشوم، فن المقاله الصحفیه، ٢٦.

(٢) فاروق أبو زید: فن الكتابة الصحفية، الطبعة الرابعة، القاهرة، عالم الكتب، ١٩٩٠، ٤.

پێهێنانی خوێنەر بە بیرۆکە، و بۆچوونەکانی بەکار دێنێت.لەم جۆرە وتارەدا دەکرێ نووسەر بە گرنگترین دەرئەنجام، یان بۆچوون دەست پێبکات، واتە شێوازی هەرەمی سەرەوژێرکراو پەیڕەو بکات.

هەر یەك لەو جۆرانەی وتار، لایەنێك لە لایەنەکانی ژیان تاوتوێ دەکات، وەك سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، رۆشنبیری، هونەری، وەرزشی، و زانستی. بەڵام بە بۆچوونی من گەر وتارێك بابەتێکی سیاسی چارەسەر کرد، لە رووی مەنهەجییەوە هەڵەیە بە وتاری سیاسی ناو ببردرێت، وەك ئەوەی ئێستا لە میدیادا باوە، و رۆژانە دووبارە دەبێتە، و بۆتە هەڵەیەکی باو، چونکە وەك ئاماژەمان پێدا سێ جۆری سەرەکی وتار هەیە، بوارە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی، و ...تاد، ژیان کە دەبنە بابەتی وتارەکان، تەنها لق و رەنگی سێ جۆرەکەی وتارن نەك جۆری سەربەخۆ.

لە تێزی ماستەرنامەکەم (فن المقاله الصحفیه فی جریده التیٓخی،٢٠٠٥-٢٠١٠،دراسه تحلیلیه)، پۆلێنێکم بۆ جۆرەکانی وتار کردووە، لەو دابەش کردنەدا پشتم بە شێوازی نووسین، یان دارشتنی وتارەکە بەستووە، واتا ئسلوبی نووسینم کردۆتە ئەساس، هەر لەسەر ئەو بنەمایە جۆرەکانی وتارم بۆ:

١/وتاری ئەدەبی ٢/ وتاری زانستی ٣/ وتاری رۆژنامەنووسی، دابەش کردووە. وتاری ئەدەبیم زیاتر بۆ ئەو دەقانە بەکارهێناوە، کە تەعبیر لە ناخ و ویژدانی نووسەر دەکەن، دەربارەی تەجرەبە یان رووداو، یان بابەتێکی کەسی، یان مەوزوعی (کۆمەڵگەیی)، بە زمانێکی سادە، و سەرنج راکێش.زۆر جار لەو جۆرە وتارەدا ئسلوبی وەسف و گێڕانەوە بەکاردێت.

بۆ وتاری زانستیش گوتومە، وتارێکە زانایان دەربارە بوارە جیاجیاکانی زانست (ئابووری، کۆمەڵایەتی، بایۆلۆژی، ئەندازیاری، پزیشکی، مێژوو، ئەدەب، میدیا، یاسا،....تاد)، بە زمانێکی زانستی دەینووسن، ئسلوب و دەستەواژەی ئەو جۆرە وتارە تایبەتە، لە لقەکانی زانستەوە سەرچاوە دەگرێ، بابەتیبوون و مەوزوعیەت خەسڵەتی سەرەکی وتاری زانستین، بە پێچەوانەی وتاری ئەدەبی، دوورە لە زاتیەت و هەست و نەستی کەسی.

وتاری رۆژنامەنووسی وەك ژانرەكانی دیكە، كۆمەڵێك ئەرك و زەزیفە ئەنجام دەدات، وەك" پێڕاگەیاندن، رۆشنبیركردن، ئاڕاستەكردن، رێنمایی كردن، تەرفیە، شرۆڤەكردنی هەواڵ، و زانیاری بەخشین.

هەموو وتارێك ئاڕاستەی هەیە، ئاڕاستەی وتار گرێدراوی ناوەڕۆكی ئەو بیرۆكەیە كە شرۆڤەی دەكات، ئەو وتارانەی هەواڵ یان لێدوان، یان رووداوێكی سیاسی بیرۆكەكەیان دروست دەكات، هەڵگری ئاڕاستەی سیاسین. ئەو پێوەرە، ئەو وتارانەش دەگرێتەوە كە بابەتە كۆمەڵایەتی و ئابووری و رۆشنبیرییەكان و...تاد، شرۆڤە دەكەن.

## هەیكەلی وتاری رۆژنامەوانی

مەبەست لە هەیكەلی وتار، بەشە پێكهێنەرەكانی وتارن، كە تێكەڵاوی و پەیوەندی بەهێزیان بەیەكەوە هەیە، بە جۆرێك ئەگەر یەكێكیان لابردرێت، نەنگی و نا هاوسەنگی دروست دەبێ، و ماناكەی نا تەواو دەردەكەوێ.

وتار لە چوار بەشی سەرەكی پێك دێت، ئەوانیش: ١/ مانشێت (ناونیشان) ٢/ سەرەتا **٣**/ناوەڕاست ٤/ كۆتایی.

ئەو بەشانە وەك كۆڵەگە و هەڵگری وتار وان، هەریەكەیان وەزیفە و تایبەمەندییەكی هەیە. مانشێتی وتار گرنگترین بەشیەتی، مانشێت وەك كلیل وایە، خوێنەر بە هۆیەوە دەچێتە نێو فەزای پان و پڕ لە دەلالاتی دەق.دیاریكردنی ناونیشان بۆ وتار، وەك گەڕانی دایك و باوكە بە دوای ناوێك پێش لە دایك بوونی منداڵەكەیان، چونكە وتاریش هاوشێوەی منداڵ بە قۆناخەكانی خەڵق بوون تێدەپەڕێ تا لە دایك دەبێت.

هەركەسێك وتارێك بخوێنێتەوە دەبێ بە ناونیشانەكەی دەست پێبكات، مانشێت وەك دەرگای گەورەی ماڵ وایە هەر كەسێك بیەوێت بچێتە ماڵێك، دەبێ بەو دەرگایە تێپەڕ ببێت، كەواتە پەیوەندی راستەوخۆی بە هەر یەك لە نووسەر و وەرگرەوە هەیە، بۆیە بایەخدان بە ناونیشان توخمی یەكەمی وتاری سەركەوتووە، پێویستە ناونیشانی

وتاری رۆژنامەوانی کورت، چڕ، رەوان، سەرنج راکێش بێ، و گوزارشت لە گرنگترین خاڵی وتارەکە بکات.[1].

پێشەکی وتاریش دوای ناونیشانەکەی دێت، رستەکانی کورت، و دیاریکراون، رستەی دەستپێکن، نووسەر لە رێگەیانەوە، خوێنەر بۆ بابەتی سەرەکی وتارەکەی ئامادە دەکات، لەو بەشەدا سەرنجی خوێنەر رادەکێشرێت بۆ خوێندنەوەی تەواوی وتارەکە، و گەیشتن بە ئەنجامی نووسینەکە لە کۆتاییدا.

درێژی و کورتی پێشەکی وابەستەی قەبارەی وتارەکەیە، ئەگەر وتارەکە دوور و درێژ بوو، دەکرێ درێژداری تێدا بکرێت و هەندێك وردەکاری تێدا بخرێتەروو.ماددەی سەرەکی دەستپێك، کە بیرۆکەی سەرەکی وتارە، دەکرێ لە هەواڵێك، تێڕوانینێك، مەشهەدێك، وەسف کردنی دیاردەیەك، و پەندێکی پێشینان یان قسەیەکی نەستەق پێك بێت.

سەرەتای وتار کۆمەڵێك وەزیفەی هەیە، لەوانە" ئامادەکردنی خوێنەر بۆ خوێندنەوە، نیشان دانی بیرۆکە یان بابەتی سەرەکی وتارەکە بەکورتی، لەگەڵ سەرنج راکێشان و هاندانی خوێنەر بۆ خوێندنەوەی وتارەکە.

پێشەکی وتارە رۆژنامەوانییەکان چەند جۆرێکن، وەك: پێشەکی پرسیاری، پێشەکی دیالۆگی، پێشەکی ئینشایی، پێشەکی وەسفی، پێشەکی هەواڵی، پێشەکی تەعریفی (نساندن)، پێشەکی بەراوردکاری، پێشەکی، کورت، و پێشەکی وەرگیراو (مقتبس).[1]

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، المقاله الصحفیه، ١٢٥-١٢٨ .

(١) لە کتێبەکەم (فن المقاله الصحفیه) بە شێوەیەکی تێروتەسەل باسم لەو جۆرانە کردوە، و پێشەکی چەند وتارێکیشم شیکردۆتەوە.

لەم وتارەدا (حکومەتی زۆرینە یان گەڕانەوە بۆ چوارگۆشەی یەکەم؟؟) کە لە رۆژنامەی خەبات بڵاوم کردۆتەوە، سەیر بکە جۆری مانشێتەکە پرسیارییە، پرسیارێك لای خوێنەر دەوروژێنێ، بۆ سەرنجڕاکێشانی، و بەشداریپێکردنی لە خوێندنەوە و لێکدانەوەی واتاکانی وتارەکە، ئینجا تێبینی بکە سەرەتای نووسینەکە چ پەیوەندیەکی بە مانشێتەکەوە هەیە، لەم بەشەدا هەوڵم داوە تەرکیز لە سەر خستنەڕووی بیرۆکەی سەرەکی وتارەکە بکەم، کە لە مانشێتیشدا ئاماژەم پێداوە، ئەویش (حکومەتی زۆرینە)یە:

هەڕەشەکانی لیستی دەوڵەتی یاسا بە پێکهێنانی حکومەتی زۆرینە و کۆتایی هێنان بە حکومەتی شەراکەت هەنوکەیی و تازە نین، پێشتریش ئەندامانی ئەو لیستە لە بۆنە و پێشهاتی جیاجیادا جێگرەوەیەکی وەهایان لەبری حکومەتی شەراکەت بە گوێی گەلانی عێراق و هێز و قەوارە سیاسییەکان داداوە، ساڵی ٢٠١٠ پێش مۆرکردنی پرۆتۆکۆلە سیاسییەکەی هەولێر، لەسەروبەندی هەوڵەکانی پێکهێنانی حکومەت، مالیکی و لیستەکەی چەند جارێك وەك فشارخستنە سەر لیستی عێراقییە و هێزە سیاسییە سونییەکان پێکهێنانی حکومەتی زۆرینەیان بەبیانوی دەربازبوون لەو قەیرانە سیاسییەی کە عێراق بەهۆی دواکەوتنی پێکهێنانی حکومەتەوە تێیکەوتبوو، دەخستەڕوو،،ئەم سیناریۆیە لەکاتی قەیرانەکەی هاشمیشدا دووبارە بۆوە، لیستی دەوڵەتی یاسا بێ هەبوونی هیچ پەیوەندییەك لە نێوان

*قەیرانەکەی هاشمی و فاکتەرەکانی هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی شەراکەت هەمدیس کەوتە فرێدانی لێدوانی لەمجۆرە، تەرحی حکومەتی زۆرینە لە رابردوودا لەلایەن دەوڵەتی قانونەوە تەرحێکی شەرمنانە و ناستراتیژی بوو، مالیکی لە لێدوانەکانیدا سەرپێی باسی لێوەدەکرد و زۆر نەدەچووە نێو وردەکارییەکانەوە، وەلێ هەنووکە ئەم مەسەلەیە بەردەوام بە وردەکاریی و تەفاسیلەوە لەلایەن دەوڵەتی یاساوە بەئەنقەست لە راگەیاندنەکاندا دەخرێتەڕوو، بەناو مونەزیرە سیاسییەکانی ئەو لیستە فاکتەر و بیانووی جۆراوجۆر دەیننەوە و ئاشکرا فەشەلهێنانی حکومەتی شەراکەتیان راگەیاندووە.*

*دەکرێ ئەم پێشەکییە بە پێشەکی تەعریفی ناو بەین، چونکە وتارنووس بە پشت بەستن بە زانیاری، و باکگراوندی مەعریفی خۆی هەوڵیداوە دەلالەتەکانی (حکومەتی زۆرینە) کە لە مانشێتەکە ناوی هاتووە، بۆ خوێنەر شیبکاتەوە، و تێی بگەیەنێ مەبەستی بەکارهێنانی لەم وتارەدا چییە.*

ناوەڕاست، سێیەم بەشی وتارە، شوێنی شرۆڤەکردن و شیکردنەوەی بیرر و را و بۆچوونەکانی نووسەرە، وتارنووس لەو بەشەدا، بە پشت بەستن بە بەڵگە، و حوجە، و گەواهی، هەوڵی قەناعەت پێهینانی خوێنەر بە بۆچوونەکەی دەدات، هەندێك بە ناوەڕۆك و مەتنیش ناوی دەبەن، دەکرێ بریتی بێ لە" بەڵگەنامە، داتا، دەرئەنجام، حەقائق، باکگراوندی مێژووی، و رەهەندەکانی بابەتەکە.

وەزیفەی ئەم بەشەی وتار بریتییە لە قەناعەت پێهێنانی خوێنەر، هەروەها تێرکردنی حەزی بۆ زانیاری و مەعریفە، بەهۆی ئەو بەڵگە و داتا و زانیارییانەی پێشکەش دەکرێن.

ناوەڕۆکی وتاریش چەند جۆرێکی هەیە، وەك" پرسیاری، وەڵامی (وەڵامی پرسیارەکانی سەرەتای وتار دەداتەوە)، ئیقتیباسی، و شرۆڤەیی.

- ***تێبینی بکە دوای دەستپێك، وتارنووس چۆن دەچێتە سەر*** *ناوەڕۆك یان ناوەڕاستی وتار:*

*لە ئێستادا مالیکی و لیستەکەی وەك پرسێکی ستراتیژی تەماشای هەرەسهێنان بە مۆدیلی حکومەتی شەراکەت دەکەن، گەر دووبارە خستنەڕووی ئەم بابەتە بەم گەرم و گوڕییە لە ئان و ساتی ئێستادا فاکتەری تەکتیکی و هەنوکەیی تەحەکومی پێوەبکەن وەك گوشارخستنە سەر لایەنەکان بەر لە گرێدانی کۆبوونەوەی نیشتمانی و ناکۆکییەکانی مالیکی لەگەڵ هەرێمی کوردستان لەسەر پرسی دیموکراسی و ماددەی ١٤٠ و یاسای گاز و نەوت و گرێبەستە نەوتییەکان و پێکهێنانی هێزی دیجلە، واتە بیەوێت بەهۆی ئەم تەرحەوە گوشار بخاتە سەر لایەنەکان، ئەوا لەبنەڕەتدا دەوڵەتی یاسا وەك مەسەلەیەکی ستراتیژی و دوورمەودا کار بۆ بەواقیعکردنی حکومەتی زۆرینە دەکات.*

*ئەگەرچی من لەبنەڕەتدا لەگەڵ حکومەتی شەراکەت و ئەوەی بە مەبدەئی دیموکراسەتی تەوافوقی ناودەبرێت نیم، چونکە کەموکوڕی ئیشکالیەتی زۆری تێدایە و هۆکارێکە بۆ خەساندنی دیموکراسی،و چەندین خراپی دیکە کە ئێرە جێی باسکردنی نییە، بەڵام لەبارودۆخی هەندێك ولاتدا، بەتایبەت ئەوانەی لە قۆناخی راگوزاری و سەرەتای سیستەمی دیموکراسیدان، یان تەرکیبەی ئیتنی و تائیفی و ئایینی و مەزهەبیان ئاڵۆز و کێشەدارە، تاکە بژاردەی حکومڕانییە گەر بژاردەیەکی*

*خراپیش بێ، له وڵاتێکی وەك لوبناندا که تاڕادەیەك تەرکیبەی تائیفی و سیاسی نزیکه له عێراق،مۆدێلی تەوافوق رەغمی هەموو کەموکوڕییەکانی تاڕادەیەکی باش لەوەتەی ئیتیفاقییەی تائیفەوە (که کۆتایی بەشەڕی نێوخۆی لوبنان هێنا) سەرکەوتووبووە لەچەسپاندنی جۆرێك له ئاشتی و تەناهی لەو وڵاتە.له عێراقیش بەهەمان شێوە سەرباری کاریگەری سلبی لەسەر ئەدای حکومەت و ئیقرارکردنی چەند یاسایەکی گرنگ، بەشی سەرەکی ئەو ئیستیقرارە نسبییە که ئێستا عێراق بەخۆیەوە دەبینێ بۆ حکومەتی شەراکەت و مەبدەئی تەوافوق دەگەڕێتەوە لەگەڵ ئەوەی که هەردەم ئەو لایەنەی زۆرینەی ئینتیخابی لەدەست بووە تاسە و کۆسپی لەبەردەم شەراکەت دروستکردووە و رێگری کرددوە له بەرجەستەکردنی ئەو مەبدەئە له ئەرزی واقیعدا.*

*لەم بەشەدا وتارنووس بە پشت بەستن بە کۆمەڵێك حەقائق و رووداوی سیاسی، ناوەڕۆك یان ناوەڕاستێکی شرۆڤەیی پێشکەش کردووە، ئەوەی شیکردۆتەوە چۆن دەڵەتی یاسا بە پێی بەرنامەیەکی پێشوەخت هەوڵی ئیلغاکردنی حکومەتی تەوافق و  بە واقیع کردنی حکومەتی زۆرینە دەدات.*

دوا بەشی وتار، (کۆتایی)یە، ئەو بەشە خولاسەی بۆچوون، و ئەنجامەکان لە خۆدەگرێت، دەرهاوێشتەی سەرەتا و ناوەڕاستە، یان درێژکراوەی ئەوانە، دوا شتە لە مێشکی خوێنەر جێگیر دەبێ، بۆیە پێویستە کورت و چڕ و سەرنج راکێش بێ، تەعبیر لەو ئەنجامە بکات کە نووسەر پێی گەیشتووە.

کۆتایی وتار هاوشێوەی بەشەکانی دیکە، چەند وەزیفەیەکی هەیە، گرنگترینیان" بانگهێشت کردنی خوێنەر بۆ بەشداریکردن لە دۆزینەوەی چارەسەری بۆ ئەو رووداوە یان دیاردەیەی تیشکی دەخرێتە سەر، هەروەها هاندانی جەماوەر بۆ ئاراستەکردن یان هەڵوێست وەرگرتن بەرامبەر پرسێکی دیاریکراو.

کۆتایی وتارە رۆژنامەوانییەکان چەند جۆرێکن، ئەوانیش" کۆتایی نادیار (ئاڵۆز)، کۆتایی دیالۆگی، کۆتایی پرسیاری (نووسەر وەڵام و دەرئەنجامەکان بۆ خوێنەر جێدەهێڵێ)،کۆتایی وەڵامدانەوە، کۆتایی وەسفی، کۆتایی پەند و حیکمەت.[١]

- لە دوا بەشی وتاردا تێبینی بکە وتارنووس ئەنجام و رادەربڕینی بۆ ئەم بەشە جێهێشتووە:

لە بارودۆخی ئێستای عێراقدا عێراقییەکان هیچ بژاردەیەکی باشتریان لەبەردەستدانیە غەیری رێکردن لەگەڵ مەبدەئی تەوافوق و حکومەتی شەراکەتدا نەبێ چونکە حکومەتی زۆرینە تەنها لەو ولاَتانەدا سەرکەوتووە کە لە قۆناخی دیموکراسی راستەقینەدان نەك بۆ ولاَتێکی وەك عێراق کە هێشتا لە ئەلف و بێی دیموکراسی دایە، بۆیە هەرەسهێنان بە مۆدیلی شەراکەت لە حوکمڕانیدا کە هەنووکە لەلایەن دەوڵەتی یاساوە بەبیانو و پاساوی جۆراوجۆر وەك مەسەلەیەکی ستراتیژی مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ و کاری بۆ دەکرێت،هەنگاوێکی یەگجار مەترسیدارە و بۆی هەیە سەرجەم ئەوەی بونیادنراوە سەراوژێر بکا و باررودۆخەکە بگەڕێنێتەوە چوارگۆشەی یەکەم، هاوکات رێگە بۆ چەسپاندنی تاکڕەوی و حوکمی تایەفەگەری خۆشدەکات کە عێراقییەکان دەیان ساڵ بەدەستییەوە ناڵاَندیان.

دەکرێ ئەم کۆتاییە بە کۆتایی وەڵامی ناو ببەین، چونکە نووسەر هەوڵی داوە وەڵامی پرسیارەکەی مانشێت بداتەوە و بە کراوەیی بۆ خوێنەری جێنەهێڵێت، ئەو دەرئەنجامێکی ئاشکرای پێشکەش کردووە کە دەڵێت: هەنگاوێکی یەگجار مەترسیدارە و بۆی هەیە

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، فن المقالە الصحفیە، ١٧٠- ١٧٧ .

سەرجەم ئەوەی بونیادنراوە سەراوژێر بکا و باررەدۆخەکە بگەڕێنێتەوە چوارگۆشەی یەکەم،هاوکات ڕێگە بۆ چەسپاندنی تاکڕەوی و حوکمی تایەفەگەری خۆشدەکات.....

وتار، تاکە ژانری رۆژنامەوانییە کە رۆژنامەنووس بە ئاشکرا بیرو بۆچوونەکانی تێدا بەیان دەکات، گەر پەیامنێر لە رێگەی گواستنەوەی هەواڵەوە بیەوێت زانیاری نوێ بە وەرگر رابگەیەنێ، ئامادەکاری بەدواداچوونیش هەوڵبدا بەهۆی بەدواداچوونەوە تیشك بخاتە سەر بیرۆکەیەك، ئەوا وتارنووس لە رێگەی وتارەوە بیرۆکە، و بۆچوونەکانی بەیان دەکات.

جۆرەکانی وتار هەر کامێك بن، سەروتار، ستوون، یان وتاری شرۆڤەیی، بونیە و هەیکەلیان هەر یەکە، ئەوەی جیاوازە ناوەڕۆك و ئسلوبیانە. ناوەڕۆکیان بە پێی جۆری بیرۆکە و بابەتەکان دەگۆڕێت (سیاسی، کۆمەڵایەتی، رۆشنبیری، وەرزشی،..تاد)، ئسلوبیشیان بە پێی جیاوازی نووسەرەکانیان، چونکە هەر نووسەرە و ستایلێکی نووسینی تایبەت بەخۆی هەیە و بە کەس ناچێت، وەك دەڵێن: (الاسلوب هو الرجل)، ئسلوب بەشێکە لە کەسایەتی و شێوەی بیرکردنەوە، و تێڕوانینی نووسەر.

هەندێك وتارنووس ئسلوبیان ئەو جۆرەیە کە لە زمانی عەرەبی بە (السهل الممتنع) ناودەبردرێت، تۆ تەمەشای نووسینەکە دەکەی زۆر سادە و ئاسانە، بەڵام کە دەست دەدەیتە قەڵەم و دەتەوێ وەك ئەو بنووسی و لاسایی بکەیتەوە، ناتوانی.

هەندێکی دیکە ئسلوبیان ئاڵۆز و ئیشکە، هەندێك وتار نوسیش ستایلێکی گاڵتەجاڕیان هەیە، لە رێگەی کۆمیدیاوە بابەتەکان شرۆڤە دەکەن، هەندێکی دیکەش درێژدادڕن، هەندێکیش بە پێچەوانەوە.

ئەگەرچی وتار تاکە شوێنی رادەربڕینە، وەلێ واباشە رادەربڕینیش بە شێوەیەکی راستەوخۆ، واتە رووت و مجرد نەبێ، وتارنووسە بەتواناکان لە رێگەی شرۆڤە و ریزبەند کردنی زانیاری و بەڵگەکان، راو و بۆچوونیان بەیان دەکەن.

پێویستە قالبی وتار قالبێکی مەحکەم و یەك پارچە بێ، یەك ئەندامی هەموو بەشەکانی کۆبکاتەوە، کاتێك خوێنەر دەیخوێنێتەوە هەست بکات لەبەردەم یەك دەق دایە نەك زیاتر، دەبێ هەموو بەشەکانی (لە مانشێتەوە تا کۆتایی) گوزارشت

له یەك بیرۆكە بكەن، خستنەڕووی زیاتر لە برۆكەیەك كارێكی خراپە، چونكە لاوازی و نەنگی بۆ وتارەكە دروست دەكات، و مێشكی خوێنەریش پەرش و بڵاو دەكات.

له وتاردا، وەك زۆربەی ژانرەكانی دیكە بكەر بە دەمی رانەبردوو بەكار دێت، بە گشتیش شێوازی هەرەمی ئاسایی (رێك) پەیڕەو دەكرێت، بەڵام زمانی نووسینی پێویستی زیاتری بە وشەی باق و بریق و جوانكاری هەیە.

## رەخنەی ئەدەبی و هونەری

تێكستە رەخنەییەكان لە میدیادا ئەو تێكستانەن لە رێگەی شرۆڤە و خستنەڕوو و خوێندنەوەوە، بەرهەمە رۆشنبیرییەكان، ئەدەب و هونەر (شیعر، رۆمان، چیرۆك، كتێب، سینەما، دراما، شانۆ، مۆسیقا، شێوەكاری، و...تاد) تاوتوێ دەكەن.(١)

بواری رەخنەی رۆژنامەگەری، ئەوەندەی پێویستی بە ئاگاداری و بایەخدان بە بورای ئەدەب، یان هونەر هەیە، ئەوەندە پێویستی بە پسپۆرییەتی نییە، چونكە ئەو جۆرە كارە كارێكی هونەرییە، نەك مەنهەجی و زانستی، وەك ئەو رەخنە و بابەتانەی مامۆستایانی زانكۆ دەینووسن، بۆیە ئەو رۆژنامەنووسەی بیەوێت ئەزموون لەو بوارە پەیدا بكات، دەبێ بەردەوام بە وردیی چاودێری هەواڵ و چالاكی و بەرهەم و سەرچاوە و ئاراستە و ناوە ناودارەكانی ئەو بوارە بكات.

زۆربەی ئەوانەی لەو بوارە كار دەكەن، تێكەڵاوی لە نێوان دوو شتی لێك جیاوازن دەكەن، ئەوانیش" رەخنە، و خستنەڕوون. رەخنەگرتن پرۆسەیەكە داهێنان،

---

(١) لە میدیای كوردی، هێشتا ئەو شێوە نووسینە سروشتی ژانرێكی سەربەخۆی وەرنەگرتووە، ئەوەی هەیە زیاتر خستنەڕووی كورت و خوێندنەوەیە، نەك رەخنەی زانستی و رادەربڕین. رەخنەی ئەدەبی، و هونەری بە مانا زانستییەكەی هێشتا لە رۆژنامەگەری كوردی لاوازە، لەوانەیە هۆكاری سەرەكی بۆ كەمی رۆژنامەنووسی پسپۆر لەو بوارە، و زاڵ بوونی لایەنی زاتی لە كرداری رەخنەگرتندا بگەڕێتەوە.

و خستنەڕوو، و بەراوردکردن لە خۆیدا کۆ دەکاتەوە، بە شێوەیەکی گشتی دەبێ رەخنەی رۆژنامەوانی ئەو توخمانەی خوارەوە لەخۆ بگرێت:[٢].

- **ناساندنی بابەتی رەخنەکە:** بۆ نموونە ئەگەر رۆمان بوو، لە سەرەتای بابەتەکە، ناونیشانەکەی، ناوی رۆمان نووسەکە، ناوی خانەی چاپ و شوێنەکەی، ژمارەی لاپەڕەکانی، لەگەڵ نرخەکەی، بنووسە، ئینجا خستنەڕووی دەروو و بەشەکانی لەگەڵ بیرۆکەی سەرەکی رۆمانەکە، دەکرێ ئاماژە بە هەندێك لە ناوەڕۆکە گرنگەکانیش بدەی، وەك خۆیان لە نێو دوو کەوانە دایانبنێیت. بۆ خستنەڕووی فلمێکی سینەماییش هەمان ئەو شتانە دەکەیت، بەڵام ئاگاداربە زیاد لە پێویست باس لە ناوەڕۆك مەکە بە شێوەیەك خوێنەر هەموو شتێك بزانێ، و پێویستی بە خوێندنەوە یان تەماشاکردنی نەبێ. ئەگەر بابەتەکە پێشەنگایەکی وێنەکێشان یان نەحت بوو، پێویستە ناوی هونەرمەندەکە بنووسی.

- **بەراوردکاری لە نێوان ئەو کارەی نووسەر یان هونەرمەندەکە لە گەڵ کارەکانی رابردووی بکە:** هەوڵ بدە بزانی چ گۆڕانکارییەك روویداوە، ئایا هەر لە سەر رێچکەی جارانییەتی یان رێچکەیەکی دیکەی گرتۆتەبەر، ئەگەر وایە توخمەکانی ئەو رێچکەیە لە کارە نوێیەکەی دیاربکە، و ئاسەوار، و هۆکارەکانی بۆ خوێنەر شی بکەوە.

- **گەڕانەوە بۆ سەرچاوە و قوتابخانە و ئاڕاستە هونەرییەکان:** تا بزانی کارە نوێیەکە چەند لەگەڵ ئەوانە لێك دەداتەوە، ئایا لە هەمان چوارچێوەیە، یان رێگەیەکی دیکەی گرتۆتە بەر، هەروەها ئەگەر وایە هۆکارەکان چین.

- **خوێندنەوە یان تەماشاکردنی بەرهەمە هاوشێوەکانی هونەرمەندانی دیکە:** تا بزانی رادەی کارتێکردن و کاریگەرییان بە یەگدی چەندە، چیان لە یەکتر وەرگرتووە، خۆیان چ ئیزافەکیان هەیە.

- **دیاریکردنی باکگراوندیان:** جگە لە باکگراوندی رۆشنبیری، هەوڵ بدە باکگراوندی سیاسی و کۆمەڵایەتیشیان دەسنیشان بکەی، تا ئەگەر کاریگەری لەسەر بەرهەکان هەبوو، رادە و شێوازیان دیاربکەیت.

---

(٢) سەرچاوەی پێشوو، جاك موریکان، ٧٩- ٨١ .

- **هەرگیز راستەوخۆ راو و بۆچوون دەرمەبڕە:** قەت بە ئاشكرا مەڵێ بابەتەكەم پێ باش بوو یان خراپ..تاد، بەڵكە بڵێ" لەوانەیە لای كەسێكی شارەزا، یان خاوەن ئەزموون و سەلیقە، ئەم كار خۆش و سەرنج راكێش یان سەركەوتوو بێ.....تاد.

- **هەوڵ بدە ئسلوبی نووسینەكەت تەڕ و سەرنج راكێش بێ:** وشەی جوان و بریقەدار بەكار بێنە، بەڵام بێ زێدەڕۆیكردن، بونییەی نوسینەكەشت لە سەر دەمی رانەبردوو بونیاد بنێ.

- **زیادكردنی مەعریفە و رۆشنبیری وەرگر:** پێویستە نووسینەكە وا پڕ زانیاری بێ، خوێنەر هەست بكات زانیاری و ئیزافەیەكی نوێی وەرگرتوو، هەوڵ بدە مەعریفەی وەرگر بە ئاماژەدان بە ناوی چەند بەرهەمێكی دیكەی لێكچوو لەو كارە، دەوڵەمەند بكەی.

***• لە دەستپێكی نووسینەكە، بابەتەكە بە وەرگر بناسێنە:***

*- رۆمانی (....) كە لە (٣٤٧) لاپەڕ پێك دێت، خانەی (....) بۆ چاپ و بڵاوكردنەوە لە هەولێر چاپی كردووە، لە نووسینی (....)، نووسەر لەو رۆمانەیدا هاوشێوەی كارەكانی دیكەی....*

*- تابلۆكانی هونەرمەند (.....) كە لە گەلەری (......) لە شاری سلێمانی تا ١٥ ئەم مانگە نمایش دەكرێت، تێكەڵەیەكن لەكۆكردنەوەی سوریالیەت و واقیعیەت، پێشەنگاكە لە ژێر ناونیشانی (....)یە، رۆژانە لە ٣ دوای نیوەڕۆ تا ٦ ئێوارە پێشوازی لە میوانان دەكات....*

- فلمە نوێیەکەی ئەم جارەی دەرهێنەری لاو (.....) زۆر جیاوازە لە بەرهەمەکانی رابردووی، ئەم جیاوازییە هەر لە ناونیشانەکەیەوە (....) تێبینی دەکرێت....
تێبینی بکە رۆژنامەنووس لەو نووسینە رەخنەییەدا چۆن زانیارییە سەرەتاییەکانی، لە پەرەگراڤی یەکەمدا بە تێکەڵ کردن لەگەڵ جۆرێك خوێندنەوە یان هەڵسەنگاندن، پێشکەش کردووە.

- **هەوڵ بدە ئاراستەی خاوەن بەرهەمەکە، بە بەراوردکردنی لەگەڵ بەرهەمەکانی رابردووی دیار بکە:**

- تابلۆ نوێیەکانی هونەرمەند بە گۆڕانکارییەکی دیار لە ئاراستە ئیبداعییەکەی دادەندرێت، پێشەنگای ئەم جارەی جگە لە وێنەیکی سوریالی، سەرجەم تابلۆکانی دەچوونەوە سەر قوتابخانەی ئینتیباعی....
سەیر بکە نووسەر چۆن باکگراوندی مەعریفی خۆی بەکار هێناوە بۆ تیشك خستنە سەر پێشەنگا تازەکە، و هەڵسەنگاندنی پێگەی ئەم کارەی لە نێو بەرهەمەکانی رابردوودا.

- **پشت بە قوتابخانە و ئاراستە و ناودارانی بوارەکە ببەستە:**

- ئەم دەرهێنەرە لاوە زۆر کاریگەرە بە شێوازی دەرهێنانی (ناوی دەرهێنەرەکە) کە ئێستا وەك قوتابخانە و ئاراستەیەکی سەربەخۆی لێهاتووە، فیلمە نوێیەکەشی هەر لەو بازنەیەدا دەخولێتەوە....

گەڕانەوە بۆ سەرچاوە، و ناودارانی بوارەکە، یارمەتیدەرە بۆ نزیك کردنەوەی کارەکە لە زهنی وەرگر و وەبیرهێنانەوەی زانیارییە گشتییەکانی، بە تایبت ئەوانەی لە سەردەمی خوێندندا وەریگرتوون.

• **بە زمانێکی سادە دوور لە موبالەغەکردن و زێدەڕۆیی بنووسە:**

- هەرگیز مەنووسە: دەرهێنەر خەیاڵی رێگەیەکی وا بۆ کارەکتەرەکان دەکات کە لەئەرزی واقیعدا....

- بنووسە: دەرهێنەر ئاڕاستەیەکی وا بۆ کارەکتەرکان وێنا دەکات، پێدەچێ یەکانگیر نەبێ لەگەڵ بینائی واقیعیانەی فیلمەکە.

لە رەخنەی رۆژنامەنووسیشدا دەبێ هاوسەنگی لە نێوان مانا، و هەیکەلی نووسیندا هەبێ، هەردەم ئەوەت لە بیر بێ تۆ بۆ جەماوەرێکی خاوەن رۆشنبیری سادە دەنووسیت.

• **هەرگیز بۆچوونەکانت بە شێوەی راستەخۆ دەرمەبڕە:**

مەنووسە: هەر لە یەکەم تەماشاکردنەوە رقت لە کارەکە دەبێتەوە بەهۆی زۆری گرتە سێکسی و وروژێنەرەکانی....

بنووسە: جێی خۆیەتی بینەر پرسیاری ئەوە لە دەرهێنەر بکات، دەبێ چ حیکمەتێك لە پشت دانانی ئەو هەمووە گرتە سێکسییە بێ لە فلمەکە؟؟

*له بیر مەکە بابەتیبوون توخمێکی سەرەکی کاری ڕۆژنامەگەرییە، هەتا لە ڕەخنە و وتاریشدا ڕۆژنامەنووسی سەرکەوتوو بۆچوونەکانی ڕاستەوخۆ دەرنابڕێت، بەڵکە لە ڕێگەی بەڵگە و سەرچاوەکانەوە، چونکە بەم شێوەیە کاریگەری لە سەر وەرگر زیاتر دەبێ.*

لە بەر ڕۆشنایی هەموو ئەوانە دەتوانین بڵێین:

وتارنووسین پێویستی بە ئەزموون و شارەزایی قووڵ هەیە، کارکردن لە بواری ڕەخنەی ئەدەبی و هونەری پێویستی بە مەعریفە و موتابەعەی بەردەوامی بوارەکە هەیە، لە هەردوو جۆردا نابێ ڕۆژنامەنووس را و بۆچوونەکانی راستەوخۆ دەربڕێ.

# بەشی شەشەم

## دیکۆر لە رۆژنامەگەری نووسراودا

بەشەکانی دیکۆر

ناونیشانی بەشەکان

ناونیشانی بابەتەکان

پێشەکی

دەروازە و کۆتاییەکان

فۆتۆ و وێنە کاریکاتێرییەکان

چوارچێوە

مەبەست لە دیکۆر ئەو شێوە و وێنەیە کە نووسینەکە تێیدا بە دیاردەکەوێت، بریتییە لە کۆمەڵێك کەرەستەی نووسین و دەرهێنان، پەیوەندیان بە شێوەی دەرهێنان و نووسینە رۆژنامەوانییەکان هەیە. بە واتایەکی دیکە بریتییە لە شکل و وێنەی تێکستە رۆژنامەوانییە بڵاوکراوەکان لە رۆژنامە، و گۆڤارەکان .

لە زمانی ئینگلیزیدا وشەی (Habillage) و (Pakaging) بۆ بەکار دێت، بەڵام لە زمانی کوردیدا دەستەواژەی دیکۆرم لە هەموو وشەیەکی دیکە لا گونجاوترە، چونکە ئەو بابەتە پەیوەندی بە نیشاندانی ستایلی گشتی نووسینەکە، و بڵاوکراوەکە هەیە. چۆن مرۆڤ جلی نوێ و پۆشتە لەبەر دەکا و هەوڵ دەدات لە رووی رەنگ و بەرینی و تەسکییەوە هەماهەنگی لە نێوان پانتۆڵ و کراسەکەی، یان چاکێت و بۆینباخەکەی هەبێ، نووسینیش لە رۆژنامەگەریدا پێویستی بە رێکخستن و جوانکاری هەیە لە پێناو سەرنج راکێشانی وەرگر، و هاندانی بۆ کڕینی بڵاوکراوەکە.

بایەخدان بە دیکۆر لە رۆژنامەگەری چاپکراودا پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆوە بینیووە، تەکنەلۆژیای ژمارەیی و داهێنانی کۆمپیوتەری تایبەت بە دیزاینی چاپەمەنییەکان، لایەنێکی گرنگی ئەو پێشکەوتنەن، لایەنێکی دیکەش پەیوەندی بەو قەیرانەوە هەیە کە رۆژنامەگەری چاپکراو بە هۆی باڵادەست بوونی تەلەڤزیۆنە ئاسمانییەکان و میدیای ئەلیکترۆنییەوە تێی کەوتووە، ئەمڕۆ وەرگر کەمتر بەرە و خوێندنەوە دەچێت، کاتێکی یەگجار کەم بۆ خوێندنەوە تەرخان دەکات، tv بۆتە سەرچاوەی سەرەکی هەواڵ و زانیاری جەماوەر، ئەگەر سەیری رۆژنامەیەك یان گۆڤارێکیش بکات هەمووی ناخوێنێتەوە، یان تەنها سەیری مانشێتی سەرەکی و مانشێتی بابەت و بەشەکان دەکات، لێرەدا دیکۆر و جوانکاری رۆڵ دەبینن لە وەستانی خوێنەر لەسەر بابەتێك، و کردنەوەی شەهییەی خوێندنەوەی بۆ خوێندنەوەی تەواوی نووسینەکە.

کەواتە ئەرکی دیکۆر لە رێگەی (مانشێتە سەرەکی و لاوەکی و پێشەکی و فۆتۆ و وێنەی کاریکاتێری و دیزایینەوە) هاندانی خوێنەرە بۆ خوێندنەوەی

زۆرترین بابەتی رۆژنامە و گۆڤارەکان. لەوانەیە پێشەکی، یان مانشێتێکی لاوەکی، یان کاریکاتێرێك.... تاد، ببێتە هۆکاری سەرنج راکێشانی وەرگر و دەرئەنجام خوێندنەوەی بابەتەکە.

لە راستیدا دیکۆر لایەنێکی بازرگانیشی هەیە، دەتوانێ بە وەزیفەی فرۆشتن، یان بازاڕ پەیدا کردن بۆ بڵاوکراوەکە هەڵسێ. چۆن رێکخستنی کەل و پەل و شت و مەکی فرۆشگایەك بە دیکۆرێکی سەرنج راکێش کاریگەری لە سەر کڕیار هەیە، ئاواش دیکۆر لە رۆژنامەگەریدا کار لە فرۆشتن و پڕ بازاڕی بڵاوکاراوەکان دەکات و کاریگەری لەسەر کڕینیان دەبێ.

هەندێك سەرچاوە، دیکۆر بە (پێی قۆناخەکانی خوێندنەوە) بەسەر دوو بەشی سەرەکی دابەش دەکەن: یەکەمیان بە گشتی پەیوەندی بە بڵاوکراوەکەوە هەیە، دووەمیشیان بە بابەتەکە. لە یەکەمیاندا هێڵە گشتییەکانی شێوازی دیزاین لە بڵاوکراوەکە باڵا دەستە، دەبێ دیزاینەر لێیان لا نەدات، بەڵام لە دووەمیاندا دیزاینەر ئازادترە، دەست کراوەیە لە دانان و رێکخستنی بابەتەکان، و شوێنیان لە لاپەڕەکاندا.[1]

مەبەستمان لە هێڵە گشتییەکانی دیزاین، ماکێتی چاپکراوەکەیە، توخمە سەرەکییەکانی وەك" ناوی بڵاوکراوەکە و لۆگۆ و ئارمەکەی، ژمارەی ستوونەکان و شوێنیان، شێوەی رێنووسی پیتەکان و قەبارەیان، بۆشایی نێوان دێڕەکان، شوێنی دانانی ژمارەی لاپەڕەکان، ناونیشانی بەشەکان، و ئەو شریتەی ناوی خاوەنی بڵاوکراوەکە و بەرپرسانی و ناونیشانی بڵاوکراوەکە، و ئەو چاپخانەیەی لێی چاپ دەکرێت، دیاریدەکات.

ماکێت پەیوەندی راستەخۆی بە نووسینەوە هەیە، هەندێك مەرج لەسەر نووسەران دادەنێت، پێویستە پابەندی بن، وەك" ژمارەی وشەکانی مانشێت و لیدەکان، شێوازی نووسینی کۆمێنێت لە ژێر وێنەکان، پابەندبوون بە ژمارەی دێڕەکانی مانشێت و پێشەکی، دەرهێنانی هەندێك مانشێتی تایبەت بۆ بەرگ یان لاپەڕەی یەکەم، و ...تاد.

---

(١) پێویستە دیزاینەر هونەرمەندی وێنەکێشان بێ، سەلیقەیەکی باشی هونەری هەبێ، یان هەر هیچ نەبێ خودان زەوقی هونەری هەبێ و حەز لە وێنەکێشان بکات و موتابەعەی ئەو بوارە بکات.

## توخمەکانی دیکۆر

دیکۆر چوارچێوەیەکی گشتییە، لەم توخم یان بەشانە پێك دێت:[1].

### یەکەم: مانشێتی بەشەکان:

بەشەکان ئەو لایانانەی ژیانن کە بڵاوکراوەکە بایەخیان پێدەدات (کۆمەڵایەتی، ئابووری، رۆشنبیری، سیاسی...تاد)، ئەو مانشێتانە بە گشتی نووسەر دەستی نییە لە دانانیان، چونکە دەکەوێتە نێو چوارچێوەی کاری دیزاینەوە، هەموو کات لە سەرەوەی لاپەڕەکان دادەندرێن، هەندێك بڵاوکراوە، بە تایبەتی گۆڤارەکان، ئەو بەشانە بەهۆی رەنگەوە دیاردەکەن، و لە یەگدیان جیا دەکەنەوە.

خاوەنی بڵاوکراوەکە، لەگەڵ بەرپرسی یەکەم و دیزاینەر، ناونیشانی بەشەکان دادەنێن، هەندێك جار رای نووسەرانیش وەردەگیرێ، وەزیفەی ئەو جۆرە ناونیشانانە لەوەدا چڕدەبێتەوە، تایبەتمەندی بە بڵاوکراوەکە دەدات، هەروەها یارمەتی خوێنەریش دەدەن بۆ خێرا دۆزینەوەی ئەو بەشەی دەیەوێت، لەگەڵ بەخشینی دەوڵەمەندی و فرە رەنگی بە بڵاوکراوەکە.

### دووەم: مانشێتی بابەتەکان (نووسینەکان):

ئەمە ناونیشانی بەرگ و لاپەڕەی یەکەم، لەگەڵ ناونیشانی بابەتەکانی ناوەوەش دەگرێتەوە، و گوزارشت لە ناوەڕۆکی بابەتەکان دەکات.

ئەم ناونیشانانە لە بڵاوکراوەیەکەوە بۆ یەکێکی دیکە دەگۆڕێ، جۆر، و سیاسەتی بڵاوکراوەکە رۆڵ دەبینێ لە جۆری پیت و ژمارەی وشە و فۆنت و ژمارەی ئەو ستوونانەی نێو نووسینەکە کە مانشێتەکە بەسەریاندا تێدەپەڕێت، لە گەڵ سیغەی بەکارهاتوو لە داڕشتنی ناونیشاندا، کە بە گشتی واباشە بە دەمی

---

(١) صلاح قبضايا: تحرير و إخراج الصحف، ط٣، القاهرة، المكتب المصري المعاصر، ١٩٨٥، ١٢٣- ١٢٥.

رانەبردوو بێ چونکە زیندوویی، و جدییەتی پێدەدات، بەڵام هەندێك بڵاوکراوەش سیغەی رابردوو لە نووسینی مانشێتدا بەکار دێنێت.

ژمارەی وشەکانی مانشێت پەیوەندی بە جۆر و قەبارەی پیتەکانەوە هەیە، لەگەڵ ژمارەی ئەو ستوونانەی بابەتەکەی لە ناو دیزاین دەکرێت.

مانشێت نووسین لە رۆژنامەگەری خۆی لە خۆیدا هونەرە، زەوقە، پێویستی بە لێزانی هەیە، رۆژنامەنووسی هەیە ئەزموونی ٣٠ ساڵ نووسینی هەیە بەڵام لە نووسینی مانشێت سەرکەوتوو نیە، یان هەر نازانێت بینووسی.

پێویستە مانشێت بە کەمترین وشە گوزارشت لە ناوەڕۆکی بابەتەکە بکات، دەبێ بە زمانێکی سادە و مەفهوم بنووسرێ، لە زمانی کوردیدا واباشە بە رستەی ناویی، بە (بکەر) دەست پێبکات.

وەك ئاماژەمان پێدا، شێوەی مانشێت دانان لە بڵاوکراوەیەك بۆ یەکێکی دیکە جیاوازە، بۆیە ناتوانین رێسای گشتی نووسینی دیاربکەین، بەڵام دەکرێ چەند سیفاتێکی گشتی دەست نیشان بکەین، کە لەوانەوە چەند جۆرێکی ناونیشانی بابەتەکان جێگیر کراوە، بەڵام مەرج نییە هەموویان لە یەك کاتدا لە بابەتێك یان چاپکراوێك بوونیان هەبێ:

**١/مانشێتی ئامادەکاری:** ئەو مانشێتە دەکەوێتە پێش مانشێتی سەرەکی، قەبارە و قەڵەوی پیتەکانی لە پیتی مانشێتی سەرەکی بچووك و لاوازترە. لەو مانشێتەدا زانیارییە میحوەرییەکان دادەندرێت، بەڵام سەرەکییەکە وردەکارییەکانی زانیارییەکە لە خۆ دەگرێت.

*مانشێتی ئامادەکاری: لە گردبوونەوەیەکدا خانەنشینان*
*نارەزایی بە هۆی دواکەوتنی مووچەکانیان دەردەبڕن.*
*مانشێتی سەرەکی: خانەنشینێك: ئێرە جێناهێڵین تا*
*داواکارییەکانمان جێبەجێ نەکرێت.*

- ***هەندێك جار مانشێتی ئامادەکاری و روونکردنەوە، لەگەڵ مانشێتی سەرەکی دێت، واتە هەردووکیان یەگدی تەواو دەکەن:***

## بۆ بەرگرتن لە خۆنیشاندانی سەرتاسەری

## سەرۆکی حکومەت چاوی بە نێونەری خۆنیشاندەران دەکەوێت

مانشێتی سەرەکی بە ناوی کەسێك، یان ناونیشانی وەزیفی دەست پێدەکات، لە گەڵ هەموو بابەتێك بە کا رناهێندرێت، تەنها لە کاتی پێویستدا نەبێ.

**٢/مانشێتی سەرەکی:** ئەو ناونیشانە لە هەموو ئەوانی دیکە زیاتر جێبایەخی بڵاوکراوەکانە، چونکە وەزیفەی سەرەکی بریتییە لە سەرنج راکێشانی خوێنەر و هاندانی بۆ خوێندنەوەی بابەتەکە.

مانشێتێکی جێگیرە، بە پێچەوانەی ئەوانی دیکە، دەبێ لە سەرەتای هەموو بابەتێك هەبێ، هیچ رۆژنامە و گۆڤارێك ناتوانێ دەسبەرداری بێ.

زۆرێك لە بابەتە رۆژنامەوانییەکان یەك ناونیشانیان هەیە، بە تایبەت هەواڵە کورتەکان، هەندێ جار چەند هەواڵێکی کورت لە ژێر یەك ناونیشاندا کۆدەکرێتەوە.

دەکرێ مانشێتی سەرەکی دوو دێڕ یان زیاتریش بێ، ئەمە زیاتر بۆ رۆژنامەکان گونجاوە، بەو مەرجەی هەردوو دێڕەکە بە یەك فۆنت و قەبارە بنووسرێن، وەك ئاماژەمان پێدا قەبارەی پیتەکان بە پێی قەبارەی بابەتەکە و فۆنت و جۆری پیتەکانی نووسین کە چاپکراوەکە بڕیاری لە سەر داوە، دەگۆڕێت.

لە دارشتنی مانشێتی سەرەکیدا پێویستە دوو خاڵی سەرەکی لەبەر چاو بگیرێت، ئەوانیش“ قەبارە، و مانان، واتا پێشکەش کردنی کرۆکی بابەتەکە لە کەمترین وشەدا، مانشێت چەند کورت بێت، ئەوەندە زیاتر دەستی دیزاینەر کراوەتر دەکا لە گەورەکردنی، ناونیشانی گەورەش مایەی سەرنج راکێشانی زۆرترین خوێنەرە، چونکە لە هەر لاپەڕەیەکدا ئەوەی یەکەم جار نیگای خوێنەر کێش دەکات، مانشێتە گەورەکانە.

مانشێتی سەرەکی لە ناوەڕاستی بابەتەکە دادەندرێت، دەکرێ لە لای ڕاستیشەوە دابندرێت، بەو پێیەی زمانی کوردی لە ڕاستەوە بۆ چەپ دەخوێندرێتەوە، واباشە لە هەر لاپەڕەیەك، یەك مانشێتی سەرەکی هەبێ، لەگەڵ گرنگترین بابەتی لاپەڕەکە دابندرێت.

ناونیشانی سەرەکییش بۆ دوو جۆر دابەش دەبێت:

**أ/ناونیشانی ئاسایی:** مانشێتێکی ئاساییە، گرنگترین زانیاری بابەتەکە دەخاتە ڕوو، (وەزیری کارەبا چاوی بە نوێنەری موەلیدە ئەهلییەکان دەکەوێت).

**ب/ناونیشانی وروژێنەر:** مانشێتێکە ڕەمز و وروژاندنی تێدایە، هەوڵ دەدات بەو ئسلوبە زۆرترین ژمارەی خوێنەر رابکێشێت، (بڕیارێکی سەیری وەزیری دارایی). لەم جۆرە مانشێتە دەبێ ئاگاداری ئەوەبین دانانی بە شێوەیەکی بەردەوام لەوانەیە بۆ ماوەیەك خوێنەری بڵاوکراوەکە زیاد بکات، بەڵام دووبارەبوونەوەی بێ ئەوەی وروژاندنەکە گوزارشت لە ناوەڕۆکی بابەتەکە بکات، زیان بە چاپکراوەکە دەگەیەنێ و مسداقییەتی لای جەماوەر لاواز دەکات.

لە هەموو حاڵەتێکدا، نابێ مانشێت نا ڕوون، و ئاڵۆز بێ، هەروەها واباشە تا دەکرێت خۆمان لە ناونیشانی پرسیاری بەدوور بگرین، چونکە لاوازترین جۆری مانشێتە و بیرۆکەیەکی ئەوتۆ دەربارەی بابەتەکە نادات.

هەروەها گرنگە جیاکاری لە نێوان مانشێتی هەواڵ و مانشێتی بابەتەکان بکەین، یەکەمیان جووڵە و بەردەوامی تێدایە، ڕستەیەکی فعلی ڕاستەوخۆیە گوزارشت لە ڕووداوێکی هەنوکەیی دەکات، (پەرلەمان متمانە لە وەزیری ناوخۆ دەسەنێتەوە)، بەڵام دووەمیان تەشویق و ڕاکێشانی تێدایە، ڕستەیەکی ناوی ئاماژەدارە، لایەنە شاراوەکانی ڕووداوێکی بەرچاو ئاشکرا دەکات، (چارەسەری لە کۆبوونەوە چاوەڕوان نەکراوەکەی دەسەڵات و ئۆپۆزسیۆنە).

**٣/ مانشێتی تەواوکار:** بە مانشێتی ناوەڕاستیش ناو دەبرێت، زۆر بەکەمی بە کار دەهێندرێت، دەکەوێتە نێوان مانشێتی ئامادەکاری و سەرەکییەوە، بە فۆنت و قەبارەیەکی بچووکتر لە هەردووکیان دەنووسرێت، زانیارییە ناتەواوەکانی هەردووکیان تەواو دەکات.

- ***ناونیشان توخمی سەرەکی سەرنج راکێشان و خوێندنەوەی بابەتەکانە***

*- ئامادەکاری: خۆنیشاندانێکی گەورەی فەرمانبەران دژی بڕیارەکەی حکومەت - سەرەکی: فەرمانبەران هەڕەشەی پەکخستنی دامو دەزگاکان دەکەن گەر حکومەت لە بڕیاری کەمکردنەوەی ژمارەی فەرمانبەران پاشەگەز نەبێتەوە.*

*- تەواوکاری: وەزیری کار: داواکاری خۆنیشاندەران لەبەر چاو دەگرین.*

**٤/مانشێتی لاپەڕەی یەکەم یان بەرگ:** وەك ئەو لافیتە یان کەلوپەلە سەرەکیانە وایە کە لە واجیهەی فرۆشگا بازرگانییەکان، بۆ راکێشانی کڕیاردادەندرێن . ئەو مانشێتانە گوزارشت لە ناوەڕۆکی بابەتە سەرەکییەکانی بڵاوکراوەکە دەکەن، رۆڵی گرنگ لە راکێشانی خوێنەر دەبینن، و پەیوەندیان بە بازاڕ و پڕفرۆشی رۆژنامە و گۆڤارەکانەوە هەیە.

زۆربەی بابەتەکانی لاپەڕەکانی یەکەم لە رۆژنامەکان، بابەتی هەواڵین، هەندێ جار درێژەیان، یان تەواوکردنیان لە لاپەڕەکانی تر دەبێ، هەوڵ دەدرێ لەو لاپەڕەیە زۆرترین بابەتی جۆراو جۆر دابندرێت، هەندێك رۆژنامە ئێستا بەو ئاراستەیە کار دەکەن لاپەڕەی یەکەمیان وەك پێرست بە کار دێنن، تیایدا بە فۆنتێکی دیار و گەورە، ناونیشان و کورتەیك لە ناوەڕۆکی چەند بابەتێکی گرنگ و هەمەڕەنگ لە (سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و...تاد) دادەنێن، هەندێکی دیکەش وێنە و ژمارەی ئەو لاپەڕەیەی کە درێژەی هەواڵەکەی تێدا بڵاوکراوەتەوە.

بەهۆی نزیکی رۆژنامەکان لە رووداوەکانی رۆژ، سەرجەم مانشێتەکانی لاپەڕەی یەکەم، مانشێتی هەواڵین، بەڵام لە بەرگی هەفتەنامە و ئەوانی دیکەدا، لە بەر ئەوەی رۆشنایی دەخەنە سەر لایەنە شاراوەکانی بابەتەکان، مانشێتی بابەتەکان زاڵە.

بە هەرحاڵ، ناونیشانی روو (واجهە) لە رۆژنامە و گۆڤارەکان، وەك رووی فرۆشگا بازرگانییەکان وایە، دەبی توخمی سەرنج راکێشانی زمانەوانی و واتایی

له خۆ بگرێت. مانشێتی هەرە دیار و سەرەکی لە لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەکان بە مانشێتی ڕۆژنامەکە ناو دەبردرێت، لە گۆڤارەکانیشدا بە مانشێتی بەرگ ناونراوە. بەرگی گۆڤارەکان جگە لە ناونیشانی سەرەکی، چەند ناونیشانێکی دیکەش لەخۆ دەگرێت لەگەڵ وێنەکانیان، بەڵام مانشێتی بەرگ لە هەموویان گەورەتر و سەرنج ڕاکێشترە.

**٥/مانشێتی لاوەکی:** لە ناوەوەی نووسینەکە، لە نێوان وێستگە سەرەکییەکان دادەندرێت، گوزارشت لەو تەوەرە دەکات کە لێی دانراوە. ئەو جۆرە مانشێتە بۆ بابەتە دوور و درێژەکان زۆر پێویستە، بەسەر چەند تەوەرێکی دابەش دەکات.

ناونیشانی لاوەکی بە فۆنتێکی کەمێك گەورەتر لە فۆنتی نووسینەکە دەنووسرێت (دەکرێ بە پیتێکی جیاواز لەو پیتەی بابەتەکی پێنووسراوە)، پێویستە دەقاو دەق گوزارشت لە تەوەرەکە بکات، واباشە کورت و سەرنج ڕاکێش بێ، لە سێ وشە زیاتر نەبێ، دەکرێ لە گۆڤارەکان ڕستەیەکی تەواو بێ.

ئەو مانشێتە جگە لە ڕۆڵی ئاڕاستەکردن و ڕوون کردنەوە، چەند ڕۆڵێکی دیکەش دەبینێ، وەك" جوانکردنی تێکستەکە لە رووی دیزاینەوە، پێدانی هەناسەیەك بە باتەکە، و یارمەتی دانی هەستەوەری بینینی خوێنەر لە کاتی خوێندنەوەدا.

دەکرێ مانشێتە لاوەکیەکان بە شێوەی سەربەخۆش لە ستوونێك یان لە نێو بابەتەکەان دابندرێن، لەو حاڵەتەدا دەبێ بە فۆنت و قەبارەی مانشێتە ئامادەکارییەکان بنووسرێن، لێرە جگە لەو ڕۆڵانەی باسمان کرد دەبێتە هۆکارێکیش بۆ خوێندنەوە و سەرنج ڕاکێشانی وەرگر.

جگە لەو مانشێتانە چەند مانشێتێکی دیکەش هەن ڕوو، و دەرگای هەواڵ و بابەتە ڕۆژنامەوانییەکان پێك دێنن، بەڵام زیاتر لەگەڵ بابەتەکان بەکار دێن وەك" مانشێتی پرسیاری، مانشێتی دەلالی (واتایی)، مانشێتە ناو، مانشێتی ناتەواو، مانشێتی هێمایی، مانشێتی نادیار، مانشێتی هاندەر، مانشێتی کورت، مانشێتی درێژ.[(١)] ".

(١) سەرچاوەی پێشوو، فن المقاله الصحفیه، ١٣٠- ١٣١ .

## سێیەم: پێشەکی

پێشەکی تێکستێکی کورتە، دوای ناونیشان دێت، ئەویش بە شێك لە سەرنج ڕاکێشانی خوێنەری دەکەوێتە ئەستۆ، بەشی سەرەکی بابەتەکە دەخاتە ڕوو، خوێنەر لە ڕێگەی ناونیشان و پێشەکییەوە بڕیار دەدات تا کۆتایی نووسینەکە دەخوێنێتەوە یان نا.

لە نووسینە هەواڵیەکاندا، بەتایبەت هەواڵی سادە، پێشەکی حزورێکی ئەوتۆی نییە، لە شێوەی لیدێکی کورت دەردەکەوێت، بەڵام توخمی سەرەکی وتار و خوێندنەوە ڕەخنەیی و ڕاپۆرتە هەواڵییە دوورو درێژەکانە.

لە هەواڵ و ڕاپۆرتەکاندا بە فۆنتێکی گەرەتر لە فۆنتی نووسینەکە و بچووکتر لە فۆنتی مانشێتی ئامادەکاری دەنووسرێت.

پێویستە کورت و چڕ بێت، گرنگترین زانیاری بابەتەکە لە خۆبگرێت، بەڵام لە وتارەکاندا بیرۆکەی سەرەکی نووسینەکە دەخاتە ڕوو، لەگەڵ ئامادەکردنی خوێنەر بۆ خوێندنەوەی بابەتەکە.

پێشەکی جۆری زۆرە، لە کاتی قسەکردن لەسەر وتاری ڕۆژنامەنووسی چەندین جۆریمان خستە ڕوو، لێرەدا سێ جۆری دیکەی دەسنیشان دەکەین کە زیاتر لەگەڵ هەواڵ و ڕاپۆرتەکاندا دەنووسرێت، ئەوانیش بریتین لە:

١/ **پێشەکی چڕ:** گرنگترین زانیاری بابەتەکە لە خۆدەگرێت، لەگەڵ هەواڵە مورەکەبە درێژەکان بەکار دێت، ئەگەر بۆ ژانرەکانی دیکە بەکارهات، تیایدا ئاماژە بە کرۆکی بابەتەکە و هۆکاری بایەخپێدانی دەدرێت.

- ***لە پێشەکی چڕدا، دەرئەنجامە گرنگ و جومگەییەکانی بابەتەکە دەخرێتەڕوو، تا بەهۆیانەوە هانی خوێنەر بدرێت بۆ خوێندنەوەی بابەتەکە:***

*لە دوێنێوە حکومەت لە هەوڵی خێرا و چڕ و پڕ دایە بۆ کۆنترۆڵ کردنی قەیرانی سوتەمەنی کە بەهۆی*

*مانگرتنی بەنزینخانە ئەهلییەکانەوە دروست بووە، هەڵوێستەکەی دوێنێی وەزری نەوت (ناوەکەی) سەرنج ڕاکێش بوو کاتێك داوای لە ئەنجوومەنی وەزیران کرد بە تەنگ داواکاری خاوەن بەنزینخانە ئەهلییەکانەوە بێت.سەرچاوەیەك لە وەزارەتی ناوبرا بە (ناوی بڵاوکراوەکە) ڕاگەیاند:" وەزیری نەوت لە کۆبوونەوەکەی دوێنێی ئەنجوومەنی وەزیران ناڕەزایی توندی بەرامبەر بڕیارەکەی سەرۆکی حکومەت دەربڕیوە کە بێ ڕاوێژکردن لەگەڵ وەزاەتەکەی دەریکردووە، هەروەها داوای کردووە هەنگاوی بە پەلە بۆ چارەسەرکردنی قەیرانی سووتەمەنی بندرێت..." .لەم ئان و ساتەدا مانگرتنی بەنزینخانە ئەهلییەکان بەردەوام بوو، سەرجەمیان دەرگاکانیان بە ڕووی ئۆتۆمبیلەکان داخستبوو...*

تێبینی بکە نووسەر لەو پێشەکییەدا، کورتکراوەی چەند هەواڵێکی سادەی بابەتەکەی خستۆتە ڕوو، لەگەڵ لێدوانێك، لێرەدا لێدوانەکەی بۆ ئەوە بەکار هێناوە تا تایبەتمەندی بداتە بابەتەکەی و لە بڵاوکراوەکانی دیکەی جیا بکاتەوە.

**٢/ پێشەکی نوێکراوە:** لەو پێشەکییەدا نوێترین زانیاری دەربارەی بابەتەکە پێشکەش دەکرێت، بە شێوەی هەواڵی دادەڕێژرێت.

- *سەیر بکە نووسەر چۆن پێشەکی نوێکراوەی لە سیغەی هەواڵدا بۆ پێشەکی بەدواداچوون بەکار هێناوە:*

*دوای تاوانبارکردنی بەڕێوەبەری گشتی شوێنەوار بە خەمساردی و ئیهمالی لە وەزیفەکەی، دادگای باڵای تاوانەکان حکومی سێ ساڵ زیندانی بۆ ناوبراو بڕیوە، ساڵی پار کۆمەڵێك کەل و پەلی نایاب لە مۆزەخانەی*

*نیشتمانی دزرا، پاش ساڵێك لە لێكۆڵینەوە، ئەمڕۆ حوكمی یەكلاكەرەوەی دادوەر دەرچوو، پێدەچێ كۆتایی بە دۆسییەیەكی ئاڵۆز و نادیار بێنێ كە مشتومڕ و هەڵایەكی گەورەی لە میدیاكان نایەوە، لەو بەدواداچوونەدا زانیاری نوێ دەربارەی چارەنووسی كەلوپەلە دزراوەكان دەخەینە ڕوو:*

*لەوانەیە بەدواداچوونەكە ماوەیەكی زووتر پێش دەرچوونی حوكمی دادگا ئامادەكرابێ، بەڵام دانانی ئەو جۆرە پێشەكییە كە بریتییە لە (هەواڵێكی تازە)، شەوق و گەرم و گوڕی بە سەرەتای بەدواداچوونەكە داوە، بە جۆرێك وەرگر هان دەدات بۆ خوێندنەوەی.*

**٣/پێشەكی وەبیرهێنانەوە:** لەگەڵ ئەو جۆرە بابەتانە بەكار دێت كە بە ئەڵقە یان بەش بڵاو دەبنەوە، دەكرێ پێشەكی ئەڵقەكانی پێشوو لە دوو جۆرەكەی پێشوو بن، لەو ئەڵقەیەدا زانیارییەكانی پێشوو وەبیر خوێنەر دەهێندرێتەوە. هەنوكە ئەو جۆرە پێشەكییە زۆر بە دەگمەن بەكار دێت، بە هۆی كەمبوونەوەی ئەو بابەتانەی بە ئەڵقە دادەبەزن.

- ***پێشەكی وەبیرهێنانەوە زانیاری ئەڵقەكانی پێشوو بە بیر خوێنەر دەهێنێتەوە:***

*- دروست كردنی بازاڕە هاوچەرخەكەی پایتەخت لە ناوەڕاستی شاردا، نارەزایی و مقۆ مقۆی زۆری لای خاوەن بەرژەوەندییەكان، لە حكومەت و كەرتی تایبەتدا بەدوای خۆیدا هێنا، لە ئەڵقەی رابردوودا (ناوی بڵاوكراوەكە) رۆشنایی خستە سەر هۆكارەكانی رازینەبوونی شارەوانی پایتەخت بە ئەنجامدانی*

*پرۆژەکە، لەم ئەڵقەیە تیشك دەخەینە سەر هەڵوێستی*
*خاوەن موڵکەکان:*

تێبینی بکە ئەم پێشەکییە سەرباری ئەوەی زانیاری ئەڵقەی رابردوو وەبیر خوێنەر دەهێنێتەوە، هاوکات پێشی دەڵێت بابەتەکە چەند تەوەر و لایەنێکی دیکەش لەخۆ دەگرێت.

## چوارەم: دەروازە و کۆتاییەکان

دەروازە و کۆتایی هەر بابەتێك گرنگی و تایبەتی خۆی هەیە، چونکە توخمی سەرنج راکێشانی وەرگرن، خوێنەر دوای مانشێت یەکڕاست چاوی دەکەوێتە سەر دەروازەی نووسینەکە، کۆتاییەکانیش دوا شتن کە لە زهنی جێگیر دەبن.

دەروازە پێشەکی نییە، بەڵکە بەشێکە لە پێشەکی، یەکەم و دووەم بڕگەی پێشەکییەکان دەروازەن، دەروازەی سەرکەوتوو ئەو جۆرەیە دوو توخمی سەرەکی لەخۆ دەگرێت، ئەوانیش:یەکەم: تەشویق و سەرنجڕاکێشان، دووەم:یەکسەر چوونە ناو بابەتەکە.

لە سیغە هەواڵییەکان، سەرنجڕاکێشانی خوێنەر لە رێگەی بە کارهێنانی گرنگترین زانیارییەوە دەبێت، بەڵام لە وتار و بابەتە رەخنەییەکان گرێدراوی لێزانی وتارنووس و ئسلوبەکەیەتی.

لە بابەتە مەیدانییەکانیش، ئیقتیباسی راستەوخۆ و چیرۆك و گێڕانەوە و بۆچوونە دژ بە یەکەکان و قسەی نەستەق و پەندی میللی، تەشویق بە دەروازەی بابەتەکان دەبەخشن، ریپۆرتەر و ئامادەکاری هەواڵ و هەتا ئە رۆژنامەنووسانەی چاوپێکەوتنیش ئەنجام دەدەن پێویستە ئەو توخمانەیان لە بیر نەچێ، بۆ سەرنجڕاکێشانی خوێنەر لە سەرەتای بابەتەکان دایان بنێن.

- ***تەشویق بۆ وروژاندنی خوێنەر بە کار دێت:***

*- "هسەتم کرد دڵم لە لێدان دەوەستێت، بەر چاوم چاریك بوو، تەواو لە جووڵە کەوتم..."، ئەو قسانەی (.....) پێویستی بە کۆمێنت نییە، خۆی گوزارشت لە حاڵەتی سەر نشینانی پاسە وەرگەڕاوەکە دەکات...*

*- لە هەموو دونیادا هەر وایە، دەبێ پیاو دەسپێشخەر بێ و داوای زەواج یان پەیوەندی لە ئافرەت بکات، تەنها عادات و تەقالیدی ئەو دورگەیە نەبێ کە هەنگاوی یەکەمی خستۆتە سەر ژنان و دەبێ خۆیان بە دوای پیاودا بگەڕێن و داوای لێبکەن....،وەنەبێ تەنها مەسەلەی هاوسەرگیری لەو دوورگەیە جیاواز بێ، بەڵکە چەند شتێکی دیکەش جیاوازن.....*

تێبینی بکە لە نموونەی یەکەمدا نووسەر ئیقتیباسی بەکار هێناوە بۆ تێکەڵ کردنی ئیحساسی خوێنەر لە گەڵ رووداوی وەرگەڕانی پاسەکە، بەڵام لە دووەمدا پەنای بۆ بیروبۆچوونی دژ بەیەك بردووە بۆ خستنە رووی عاداتە ناباوەکانی دانیشتوانی دوورگەکە.

**کۆتایی دوا بەشی بابەتە،** لە وتار و رەخنەکاندا، دەرئەنجام و کرۆکی بۆچوونەکان لە خۆ دەگرێت، یان ئەو ئەنجامانەی نووسەر پێی گەیشتووە، لە گەڵ پێشکەش کردنی چارەسەری بۆ بابەتە وروژێنراوەکە ئەگەر پێویستی بە چارەسەری هەبێ، دەکرێ بە وروژاندنی پرسیار لە مێشکی خوێنەر کۆتایی پێبێت، پێویستە دوور بێت لە ئسلوبی ئینشائی و ئامۆژگاری کردن.

لە هەواڵ و راپۆرتەکانیشدا، هەوڵ بدە کۆتایی، زانیاری مەعریفی دەربارەی بابەتەکە بە وەرگر بدات، بۆ نموونە ئەگەر ناوەڕۆکی هەواڵەکە بریتی بوو لە تەقینەوەیەك لە ناوچەی (دۆرە)ی بەغدا، بنووسە (شیاوی باسە دۆرە دەکەوێتە

باكووری بەغدا بە دووری ١٥کم، دانیشتوانەکەی سوونە نشینن، ناوچەیەکی پیشەسازییە، پێشتریش چەندین تەقینەوەی دیکەی بەخۆوە بینیووە....).

ئەگەر هیچ شتێك یان زانیارییەکیشت نەبوو بۆ کۆتایی هێنانی بابەتەکە، با دوا تەوەری بابەتەکە کۆتایی بێ و نووسینەکەتی پێدابخە، هەرگیز بیر لەوە مەکەوە لە خۆتەوە شت دابنێی، یان زانیاری نا دروست بنووسی.

- ***لە کۆتایی دا هەردەم ئەو وێنەیە لای خوێنەر جێ بهێڵە کە بابەتەکە لەوە گرنگترە بە بۆچوونەکانی تۆ چارەسەر بێ، بەڵکە راو و بۆچوونی زیاتر هەڵدەگرێ:***

*- لە دوماهیدا، دەکرێ بڵێین زۆربەمان لە سەر ئەوە کۆکین کە پلانەکەی دەوڵەت ئەنجامی پێچەوانەی لێکەوتەوە و نەیتوانی گرفتەکە چارەسەر بکات، ئایا چاوپێخشاندنەوە بە پلانەکە بە هەمان خێرایی دارشتنی دەبێت؟؟*

## پێنجەم: فۆتۆ و وێنە کاریکاتێرییەکان:

وێنە پێکهێنەری سەرەکی دیکۆری بابەتە رۆژنامەوانییەکانە، لەگەڵ مانشێتدا واجیهەی نووسینەکان دەنەخشێنن. رۆژنامەگەری هاوچەرخ بایەخی زۆری پێدەدات، زۆربەی رۆژنامەکان لە لاپەڕەی یەکەم و کۆتاییاندا پانتاییەکی دیاریکراو بۆ دانانی فۆتۆ، بەتایبەت ئەوانەی تەعبیر لە رووداوە جیاجیاکانی رۆژ دەکەن، تەرخان دەکەن، ئەمە جگە لە دانانی وێنەی جوان و سەرنج راکێش لەگەڵ بابەتەکان.

فۆتۆ جگە لەوەی بە وەزیفەی روونکردنەوە هەڵدەستێت، جوانکاری و دیکۆریش بە بڵاوکراوە و بابەتەکان دەدات، لە رووی واتاشەوە هەڵگری ناوەڕۆکی قووڵە، هەندێ جار ئەو دەلالەتەی وێنەیەك دەیگەیەنێت، هەزاران وشە ناتوانێت گوزارشتی لێبکات.

لە رۆژنامەگەریدا، فۆتۆ بەشێکە لە مانا و تەواوکەریەتی، هەروەها راستگۆیی و مسداقیەتیش بە نووسینەکان دەدات. هەندی هەواڵ بێ دەسەبەر بوونی وێنە ناکرێ بڵاوبکرێنەوە، بۆ نموونە ئەو هەواڵەی باس لە گرتەی هونەرمەندێکی ناودار دەکات لە حاڵەتێکی تایبەتدا، یان ئەوەی زانیاری دەربارەی دیداری نهێنی سەرۆکێکی عەرەبی لەگەڵ سەرۆکی ئیسرائیل دەدات...تاد.

دانانی فۆتۆ لە گەڵ بابەتە نێوخۆییەکان، هۆکارێکە بۆ زیاتر بڵاوبوونەوەی بڵاوکراوەکە و پڕفرۆشتنی، ئەوانەی لێرانەهاتوون وێنەیان لە میدیاکان دەرکەوێت، کاتێك بڵاوکراوەیەك وێنەیان بڵاودەکاتەوە خێرا دەیکڕن، بۆیە واباشە رۆژنامە و گۆڤارەکان هەوڵی دانانی زۆرترین فۆتۆی بە کۆمەڵ (جماعی) بدەن.

لە رۆژنامەگەری عەرەبی و رۆژئاواییدا، لە نێو ئەو دۆسیە یان بەشەی بۆ روماڵ کردنی لایەنی کۆمەڵایەتی تەرخان کراوە، زۆرینەی رۆژنامە و گۆڤارەکان لاپەڕەیەك یان زیاتر بۆ بڵاوکردنەوەی وێنە تایبەتی و خێزانییەکان تایبەت دەکەن، لە بەرامبەردا پارەیەکی دیاری کراو وەردەگرن، زۆربەی کاتەکان ئەو وێنانە وێنەی ئاهەنگ و بۆنە خێزانییەکانن.

نابێ فۆتۆی رۆژنامەوانی هەر ئەوها بە رووتی دابندرێت، دەبێ لە ژێرەوە کۆمێنتێکی لەگەڵ بێ، ئەو نووسینە بە (کۆمێنتە وێنە) ناو دەبردرێت، سێ جۆرە سیاغەی هەیە، ئەوانیش"کۆمێنتی ناساندن، و هێمایی، و تێکەڵن، یەکەمیان زانیاری پێویست دەربارەی وێنەکە دەدا و دەیناسێنێ (فلان لە کاتی چاوپێکەوتنی بە فلان،یان فلان لە وتارەکەی دوێنێدا...)، دووەمیان ناوەڕۆکی فۆتۆکە هێما بۆ بیرۆکەیەك دەکات (دیجلە...رووباری قەیران و کێشە....)، سێیەمیشیان تێکەڵەیەکە لە هەردووکیان، واتە هێما و ناساندنە، (دیجلە، رووباری قەیران و کێشە..وێنەی سەروچاوەی رووبارەکە لە تورکیا).

جۆری سێیەمیان لە گەڵ ئەو فۆتۆیانە بە کاردێت کە بە شێوەی سەربەخۆ دادەندرێن، بێ هەبوونی هیچ بابەتێك، ئیماژ و زانیارییەك بە خوێنەر دەدەن.

هەندێك بڵاوكراوەش لەگەڵ وێنە سەربەخۆكاندا هەواڵێكی كورتی دوو دێڕی دادەنێن، (ئێرانییەكان یادی شۆرشی ئیسلامی لە گۆڕەپانی ئازادی دەكەنەوە، یادەوەرییەكە.......)، هەندێكی دیكەش تەنها مانشێتێك بۆ فۆتۆكە دەنووسن.

لە هەموو حاڵەتەكانیشدا دەبێ، ناوی وێنەگرەكە، یان سەرچاوەكەی بنووسرێ، ئەگەر وێنەیەكی ئەرشیفیش بوو، واباشە ئاماژە بە بۆنە و بەروار و شوێنی بدرێت.

جگە لە فۆتۆی ئاسایی چەند جۆرێكی دیكەی وێنەی رۆژنامەوانی هەن، لەوانە فۆتۆی روون كردنەوە و وێنەی كاریكاتێری. یەكەمیان ئەو وێنە داتایی و ئامارییانەن كە پێویستن بۆ نووسینەكە بە هۆی ئاماژەدانی ناوەڕۆكی بابەتەكە بە كۆمەڵە ژمارە و داتایەك. هەندێك جاریش بریتییە لە وێنەیەكی ئاسایی، داوا لە وێنەكێش یان گرافەری بڵاوكراوەكە دەكرێت بۆ كێشانی بە هۆی دەست نەكەوتنی وێنەی راستەقینە، ئەم وێنەیە بۆ بابەتی كۆمەڵایەتی و دانیشتنەكانی دادگا بە كاردێت.

سەبارەت بە وێنەی كاریكاتێریش، وەك عورفێكی باوی لێهاتووە زۆربەی رۆژنامە و گۆڤارەكان شوێنێكی دیاری كراوی بۆ تەرخان دەكەن، رۆژنامەكان رۆژانە لە رێگەی كاریكاتێرەوە تەعبیر لە سەرەكیترین رووداو یان دیاردەكانی رۆژ دەكەن، گۆڤارەكانیش بە هەمان شێوە لە گەڵ هەر ژمارەیەكی نوێدا، لە لاپەڕەی یەكەم یان ناوەڕاستی گۆڤارەكە كاریكاتێرێك بڵاو دەكەنەوە. وەنەبێ كاریكاتێر تەنها وەك فۆتۆی سەربەخۆ دابندرێت، زۆرجار لە گەڵ بابەتەكانیش دەسازێندرێ، بە تایبەت ئەو دیاردە كۆمەڵایەتیانەی گاڵتەجاڕی هەڵدەگرن، دەكرێ لە گەڵ بابەتە سیاسییەكانیش دابندرێ، وەك ئەوەی لە میدیای لوبنانی دەبیندرێت.

كاریكاتێر وێڕای وەزیفە دیكۆری و جوانكارییەكەی، لە رووی ناوەڕۆكیشەوە خزمەتی بابەت و بڵاوكراوەكان دەكات، بیرۆكەكان بە شێوەیەكی خۆش و گاڵتەجاری دەگەیەنێتە وەرگر، سەرنجی جەماوەر بۆ بڵاوكراوەكە رادەكێشێ، هەروەها زۆرجار ئسلوبێكیشە بۆ گوزارشت كردن لەو باسانەی بە پەیڤ و نووسین ناتواندرێ تەعبیریان لێ بكرێت.

## شەشەم: چوارچێوە

ناوەکەی بەخۆوەیەتی، ئەو هێڵکارییەیە تێکستێکی رۆژنامەوانی تێدا دادەندرێت، مامەڵەی نووسینێکی سەربەخۆی لە گەڵ دەکرێت، هەرچەندە لە نێو بابەتێکی سەربەخۆ (چاوپێکەوتن، پۆرترێت، هەواڵی مورەکەب، ریپۆتاژ...تاد)دیزاین دەکرێت.

باکگراوندەکەی بە رەنگێکی تایبەت دەڕازێندرێتەوە، هەروەها فۆنتی نووسینەکەش لە رووی قەبارەوە جیاوازە لە فۆنتی گشتی نووسینەکە، دەکرێ زیاتر لە چوارچێوەیەك بۆ بابەتێك دابندرێت، دوو یان سێ چوارچێوە، بەو مەرجەی ئەوەندە گەورە نەبن بابەتە گشتییەکە بشارنەوە.

چوارچێوە، هاوشێوەی فۆتۆ و مانشێتەکان دوو وەزیفەی هەیە، شکلی و ناوەڕۆکی، لە رووی شکلەوە هەناسەیەك بە هەستەوەری بینین دەدات و بە شێك لە دیکۆری گشتی بابەتەکە پێك دێنێ، لە رووی ناوەڕۆکیشەوە ئیزافەیەك دەخاتە سەر زانیارییەکانی بابەتە سەرەکییەکە.

زانیارییەکانی نێو چوارچێوە لایەنێکی بابەتەکە روون دەکاتەوە، یان ئیزافەیەکی نوێ بەو لایەنە دەدات، یان گرنگی و تایبەتمەندی، بۆ نموونە دەکرێ زانیارییەکانی وەك" باکگراوندی مێژوویی بابەتەکە، بەراوردکردن، دەرئەنجام، داتا و سەرژمێری...تاد بخرێنە نێو چوارچێوەوە.

* ***چوارچێوە، وەزیفەیەکی شکلی و ناوەڕۆکی پێشکەش دەکات:***

*- دەتوانین لە چوارچێوەدا ئەمانە دابنێین: پرۆفایلی کەسی، کتێب یان یاداشتەکانی میوانی چاوپێکەوتن، پوختەی کتێبێك کەزانیاری دەربارەی بابەتە ڕۆژنامەوانییەکەی تێدایە، و ڕۆژنامەنووس سوودی لێوەرگرتووە..*

*هەروەها دەکرێ زانیارییەکی پێچەوانە لەو زانیارییەی لە ناوەڕۆکی بابەتە سەرەکییەکە هاتووە، لە خۆبگرێت، وەك:لە زستانیشدا خواست لەسەر ناوچە گەشتیارییەکانی تورکیا هەیە تەنها لەسەر ناوچەی (.....) نەبێ.*

ئەوەی لەو بەشە خستمانە روو لایەنی دیکۆر و جوانکاری بوو لە رۆژنامەگەری چاپکراودا، بێگومان میدیای بینراویش پێویستی بە جوانکاری و دیکۆر هەیە کە لەوێدا بە (سینۆگرافیا) ناونراوە، لە بەشەکانی داهاتوو تیشکی دەخەینە سەر.

لە دوماهی ئەو بەشەدا دەتوانم بڵێم:

دیکۆر کۆمەڵێك کەرەستەی نووسراو و تەکنیکییە، ناسنامەی بڵاوکراوەکە دیار دەکات، رووی سەرەکی بابەتە رۆژنامەوانی و بڵاوکراوەکان دەنەخشێنێ، لە پاڵ وەزیفەی شکلییەوە، خزمەتی ناوەڕۆك و بیرۆکەش دەکات.

# بەشی حەوتەم

## تەکنیکی نووسین لە TV و رادیۆ

### تایبەتمەندی تەلەڤزیۆن

### تایبەتمەندی رادیۆ

### بنەماکانی نووسینی ئێستگەیی و تەلەڤزیۆنی

### نووسین لە میدیای بینراوی کوردستانی

تەکنیکی نووسین لەtv و رادیۆ هەڵگری هەمان توخمە سەرەکییەکانی نووسینی رۆژنامەوانییە، سەرجەم ئەو تایبەتمەندییانەی لە بەشەکانی پێشوو ئاماژەمان پێدا، لە نووسینی رادیۆیی و تەلەڤزیۆنیدا بوونیان هەیە، وەلێ لەبەر ئەوەی لە tv دا دەنگ و رەنگ بەیەکەوە، و لە رادیۆدا تەنها دەنگ، مانای پەیامەکان تەواو دەکەن، بۆیە لە رووی دارشتن و زمان و بەکارهێنانی کردار (فعل)دا ئەو شێوە نووسینە جیاوازی لەگەڵ نووسینی بڵاوکراوەکان هەیە.

پەیامە ئیعلامییەکانی رادیۆ و تیڤی خاڵی سەرەکی هاوبەشیان دەنگە، هاوکات لە رووی جۆری ئەو ژانرانەی روودا و دیاردەکانی پێ دەخەنە روو، لەویش تارادەیەك هاوبەشن، ئەوەی ئێستا بە فعلی لە رادیۆیدا بوونی هەیە تەنها هەواڵ و چاوپێکەوتنە، لە تیڤیشدا هەندی بابەتی دیکە.

لە قۆناخی ئامادەکردندا، جا بابەتەکە بۆ رۆژنامەگەری خوێندراو و بیێ یان بینراو و بیستراو، جیاوازییەکی ئەوتۆ نییە، جیاوازی سەرەکی دەکەوێتە قۆناخی جێبەجێکردنەوە، گەر لە کاتی ئامادەکردنی چاوپێکەوتنێك بۆ بڵاوکراوەیەك رۆژنامەنووس تەنها پێویستی بە چەند پەرەیەك و کامێرایەکی سادە هەبێ، ئەوا ئامادەکردنی هەمان بابەت بۆ تیڤی دەخوازێ رۆژنامەنووسەکە کامێرا و چەند وێنەگرێك و ئەندازیاری دەنگ لە گەڵ خۆیدا ببات، لەکاتی نووسینیشدا یەکەمیان پێویستی بە قەڵەمێك و چەند پەرەیەك هەیە، یان ئامێرێکی کۆمپیوتەر، بەڵام دووەمیان جگە لە کۆمپیوتەر پێویستی بە کۆمەڵە ئامێرێکی دیکە هەیە بە تایبەت لە قۆناخی مۆنتاژدا، لە رووی کات و تێچوونیشەوە قورساییەکی زیاتر دەخەنە سەر رۆژنامەنووس و دەزگاکەی.

## تایبەتمەندی تەلەڤزیۆن

ئەمڕۆ تەلەفزیۆن کاریگەرترین و پڕجەماوەریترین کەرەستەی میدیاییە، دەچێتە خانەی ئەو ئامرازانەی پسپۆرانی میدیا بە کەرەستە (بیستۆکە-بینۆك)یەکان ناوی دەبەن. تیڤی و میدیای ئەلیکترۆنی، رۆژنامەگەری نووسراویان خستۆتە قەیرانێکی حەقیقییەوە، خەریکە سکرینی تیڤی دەبێتە گۆڕستانی رۆژنامە و گۆڤارەکان.

توخمی سەرەکی پەیامە تەلەڤزیۆنییەکان، دەنگ و رەنگە (وێنە)، بۆیە پڕەنسیپی بنەڕتی کاری تیڤی هاوسەنگیکردنە لە نێوان هەردووکیان، دەبێ رەنگ، هاوشانی دەنگ، پەیامەکان بە کاملّی بە وەرگر بگەیەنێ.

## تەلەڤزیۆن کۆمەڵێك تایبەتمەندی هەیە، سەرەکیترینیان ئەمانەن:

- **کۆمێنتی سەر شاشە، ماناکان تەواو دەکات:** نووسینی سەر شاشە، ئەوانەی بە کۆمێنت ناو دەبرێن، ئەو بیرۆکەیە تەواو دەکەن کە دەنگ و وێنەکان بەشێکی دەگەیەنن، کۆمێنت دەتوانێ کەموکورتییە دەلالییەکان پڕ بکاتەوە کە لە وێنە هەیە، بۆ نموونە تەماشاکار وێنەی دارێك دەبینێ، لە کۆمێنتی سەر شاشەکەش دەنووسرێ: زەیتوون دارێکی باوە لە یۆنان و ئیسپانیا، و بە شێك لە ولاّتی شام.

- **تێکستەکان بە تەنها مانای ناتەواو دەبەخشن:** دەگوترێ نووسینی تەلەڤزیۆنی باش ئەو نووسینەیە کاتێك بێ وێنە دەخوێندرێتەوە ماناکەی روون نییە، یان دارِشتنەکەی نا تەواوە، کەواتە وێنەش رۆڵی میحوەری لە تەواوکردنی مانای پەیامەکان دەبینێ.

وەزیفەی تێکستی تەلەڤزیۆنی روونکردنەوەی ئەو نا تەواوی و نا روونییەیە کە لە وێنەکاندا هەیە، تەماشاکار وێنەی دارێك دەبینێ، نابێ بێژەر بڵێ ئەو دارە، بەڵکە باشتر وایە بڵێت" ئەوە دار سنەوبەرە، ولاّتی لبنان بە زەوی و ژینگەی سەرەکی دار سنەوبەر

دادەندرێت...،لێرەدا دەسنیشان کردنی جۆری دارەکە، کامڵی تێکستە خوێندراوەکە و وێنەکە بەرجەستە دەکات.

- **بەکارهێنانی دەستەواژە ئاماژەییەکان:** واباشە لەگەڵ تێکستەکانی تەلەڤزیۆن ئەو دەستەواژە ئاماژەییانەش بەکار بهێندرێت کە رێنمایی و ئاڕاستەی تەماشاکار دەکەن بۆ وێنەکان، وەك" لێرە، **(لەو شوێنەوە،** ئەو **گەنجانە،** لێرەوە، ئەو ژنە، هاوشێوەی ئێرە.)..تاد.[1].

هەنوکە تێکستێکی دیکەی تەلەڤزیۆنی سەریهەڵداوە ئەویش (سەب تایتل) ە، لە ژێرەوەی سکرینەکان دەردەکەوێت، سەردێڕی هەواڵ و رووداوە گرنگەکانی رۆژ دەگوازێتەوە.

## تایبەتمەندی رادیۆ

رادیۆ کەرەستەیەکی میدیایی بیستەکییە، مرۆڤ هاوشان لە کاتی ئەنجام دانی کرداری دیکەدا دەتوانێ گوێی لێبگرێ، هەروەها بە ئاسانی دەگوازرێتەوە بۆ هەموو شوێنێك، لە نێو ئۆتۆمبیلیشدا بە کار دێت، یەك هەستەوەری مرۆڤیش دەکاتە ئامانج، ئەویش بیستنە، ئەمانە تایبەتمەندییە دیارەکانی رادیۆن لە رووی بەکارهێنانەوە.

پرۆسەی گوێگرتن پرۆسەیەکی هەستیارە، مرۆڤ لە کاتی گوێگرتندا دەتوانێ توانای بیرکردنەوەشی بخاتە کار، واتە بیر لە پەیامە بیستراوەکە بکاتەوە و شرۆڤەی بکات، لێرەوە دژواری و هەستیاری ئیشی میدیاکارانی رادیۆ بە دیار دەکەوێت کە چۆن پە یامێکی دەنگی ئەوتۆ روون و سادە پێشکەش بکەن، وەرگر بە ئاسانی و دوور لە ئاڵۆزی و بیرکردنەوە، یەکڕاست وەریبگرێت.

خاڵی هەرە گرنگ لە تەکنیکی نووسینی رادیۆیی ئەوەیە رۆژنامەنووس بزانێ پەیامەکەی تەنها ئاڕاستەی گوێی وەرگر دەکات، هیچ هەستەوەرێکی دیکە لە گەیاندنی بەشدار نین.

---

(١)نسيم الخوري: الكتابة الإعلامية، بيروت، دار المنهل اللبناني، ٢٠٠٩، ١٢٢- ١٢٣.

ئەو شێوە نووسینە کۆمەڵێك ڕێسا و ڕێنمایی خۆی هەیە، یەکەمین خاڵ ڕەچاوکردنی ڕوونکردنەوەی ئەو شتانەیە کە نابیندرێن، بۆ نموونە کاتێك لە نێو دەنگوباسەکاندا لێدوانی کەسێك دەخرێتە ڕوو، بەتایبەت ئەگەر لێدوانەکە وای خواست کەمێك درێژ بێ، دوای کۆتا هاتنی قسەکان پێویستە بڵێی (لێرە قسەکانی فلان کۆتایی هات یان تەواو بوو)، یان جار جار بۆ وەبیرهێنانەوەی ناوی قسەکارەکە بڵێ (هەر بە پێی قسەی فلان...)، هەرگیز وشەی (ناوبراو) بەکار مەهێنە چونکە وەرگر وێنە و ناوی قسەکەرەکەی لە بەردەم نییە.

لە ڕادیۆدا هەرگیز لێمەگەڕێ ماوەیەکی درێژ تەنها دەنگێك (قسەکەرێك) بدوێت، دەبێ هەواڵەکانی ڕادیۆ کورت و پوخت بن، لە دەقەیەك زیاتر نەبن (ئەگەر هەواڵەکە خالی بوو لە لێدوان).

گۆڕینی دەنگی بێژەرەکانیش خاڵێکی دیکەیە، زۆر گرنگە ڕەچاو بکرێت، واباشە هەواڵەکان بە دەنگی دوو بێژەر بگوازرێنەوە، تا وەرگر تووشی مەلەل نەبێ، یان ئەگەر نا ناوبڕێکی مۆسیقیان تێبکرێت.[(١)]

لەکاتی پێشکەش کردنی بەرنامەکانیش هەمدیس دەبێ ئەو لایەنە ڕەچاو بکرێت، واباشە بڕگەیەکی ڕێکلامی یان مۆسیقیان بخرێتە ناو، دەکرێ ڕێکلام کردن بێ بۆ جۆر و کاتی بەرنامەکە.

پێویستە هەوڵ بدرێ هەواڵەکان لە سەر کەمترین پەڕ بنووسرێن، یان هەواڵێك زیاتر لە پەڕێك داگیر نەکات تا لە کاتی خوێندنەوەیدا دەنگی وەرگێڕانی پەڕەکان دەرنەچێت. ڕەچاوکردنی خاڵبەندیش لە نووسینەکاندا خاڵێکی یەگجار پێویستە، دەبێ خاڵ و فاریزە و کەوانەکان لە شوێنی خۆیان دابندرێن، بێژەریش لە کاتی خوێندنەوەدا تەواو پابەند بێ پێیان، چونکە کار لە مانا و گەیاندنی پەیامەکە دەکات.

---

(١) هەندێك ڕادیۆی ئەوروپی، بە تایبەت جیهانییەکان، وەك مۆنتیکارلۆ، و bbc، ناوبڕی کورت دەخەنە نێو دەنگوباسەکان، تیایدا بە دەنگێکی دیکە ناوی ڕادیۆکە بە بیری گوێگر دەهێننەوە:( ئێرە بی بی سی یە، کات نۆ و چارەگی بەیانییە، بەردەوامین لە سەر پێشکەش کردنی درێژەی هەواڵەکان)، ئینجا بێژەری دەنگوباسەکە جڵەوی قسەکردن دەگرێتەوە دەست و درێژە بە خوێندنەوەی هەواڵەکان دەدات.

دەنگی بێژەر دەبێ ساف و ڕەوان و کەمێك جیاواز بێ، بێژەری سەرکەتوو خاوەن ئسلوبێکی تایبەتی خوێندنەوەیە، هەر کە گوێگر گوێبیستی دەنگی بوو، دەیناسێتەوە و ناوەکەی بە بیر دێتەوە.

ئەمڕۆ ژانرە سەرەکییەکانی ڕادیۆ، هەواڵ و چاوپێکەوتنن، دەنگ و باسەکان بە گشتی لەو دوو ژانرە پێك دێن، لەو هەواڵانەی سەرچاوەکەیان رووماڵ کردنە، دەتواندرێ دەنگە سروشتییەکە وەك خۆی بگوازرێتەوە، هەروەها دەشبێ وەك خۆی لە سەر زاری بێژەرەکە بخوێندرێتەوە.

چاوپێکەوتنی ڕادیۆییش هاو شێوەی چاوپێکەوتنی بڵاوکراوەکان، پێگە و گرنگی هەیە، بە شێوەی سەربەخۆ، هەروەها لە نێو هەواڵەکانیشدا بڵاودەکرێتەوە، زۆربەی کاتەکان ڕاستەوخۆ لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە ئەنجام دەدرێ، و ڕاو و بۆچوونی لایەنی پەیوەندار دەربارەی هەواڵێك یان ڕووداوێك بۆ گوێگر دەگوازێتەوە.

## بنەماکانی نووسینی ئێستگەیی و تەلەڤزیۆنی

ئەگەرچی هەر یەك لە ڕادیۆ و تەلەڤزیۆن خودان کۆمەڵێك خاسیەتی تایبەتین، بەڵام لە رووی نووسینەوە چەند بنەما و ڕێسایەکی هاوبەش کۆیان دەکاتەوە، و لە تەکنیکی نووسینی بڵاوکراوەکان جیایان دەکاتەوە، لێرەدا هەوڵ دەدەین بە پراکتیکی بیانخەینە روو و شییان بکەینەوە:(١).

(١) لونارد راي تيل، مدخل الى الصحافة- جولة في قاعة التحرير- ت:حمدي عباس، ط٢، القاهرة، الدار الدولية للتوزيع و النشر، ٢٠٠٢، ١٠١ .

**١/دووباره دارشتنەوه:**

*لە رۆژنامەگەری خوێندراودا تا رادەیەك ئاساییە ئەگەر ئیقتیباسەکان کەمێك درێژ بن، بەڵام بۆ رادیۆ و تیڤی ئەمە هەرگیز گونجا و نییە، لەبەر دوو هۆی سەرەکی ئەوانیش" بە هۆی زەحمەتی گوێگرتن یان تەماشاکردنی وەرگر بۆلێدوانێکی دوور و درێژ، هەروەها لە بەر ئەوەی بەردەوام بوونی یەك دەنگ بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ شتێکی نەخوازراو و خراپە.*

*بەر لەبەرچاوگرتنی ئەو لایەنە، دارشتنی رادیۆیی و تەلەڤزیۆنی پێویستی بە دیقەت و وردبینی زۆر هەیە، دەبێ بە شێوەیەك بێ کورت و مانا بەخش بێ، و تەواوی لایەنەکانی بابەتەکە روون بکاتەوە، واتە لە کاتی بیستنی یان بینینی هیچ لایەنێکی ناروون نەبێت لە زهنی وەرگر.*

- ***با رستەکانت هێندەا روون بن، هەر لەگەڵ بیستنی وەرگر تێی بگات***

*مەنووسە: هەروەها گوتی لەوەتەی وەرگرتنی ئەو پۆستە ٥ ساڵ پێش ئیستا داوا دەکەم چاکسازی لەو بوارە بکرێت.*

*بنووسە: هەروەها گوتی: ٥ ساڵە من داوای چاکسازی لەو بوارە دەکەم، بەڵام کەس گوێم پێنادات، هەر لەگەڵ دەست بەکاربوونم....*

**٢/ ژمارەكان بە نزيك كراوەيى بخوێنەوە نەك بە درێژيى**

واباشە لەو تێكستانەی تايبەت بە راديۆ و تيڤى دەنووسرێن ژمارەكان وەك خۆيان بە درێژی (٢٩٨٣٦٧٠) نەخوێندرێنەوە، بەڵكە بە لە نزيكی (نزيكەی دوو مليۆن، زياتر لە سەد هەزار، كەمتر لە پێنج هەزار...تاد).چونكە خوێندنەوەی تەواوی ژمارەكە مێشكی وەرگر مشەوەش دەكات، ناچار دەبێ تەركيز بخاتە سەری، دەرئەنجام ناتوانێ زانيارييەكانی دوای ژمارەكە كۆنترۆڵ بكا و بە ناتەواوی لە پەيامەكە تێدەگات.

**٣/ با رستەكان كورت و راستەوخۆ بن:**

تێكستە راديۆيی و تەلەڤزيۆنييەكان لە رستەی كورت و راستەوخۆ پێك دێن، هێندە كورت و سادەن، بێژەر زۆر بە ئاسانی دەتوانێ وشەكانی بە دەنگێكی بەرز دەربڕێت.

ئەو شێوە نووسينە هێندە سادەيە ئەگەر بێ وێنە بخوێندرێتەوە، يان بدرێتە رۆژنامەيەك، هەست دەكرێت سياغەكەی لاوازە و ماناكەشی ناتەواوە.

- ***تێكستەكە لە سەر رستەی كورت و راستەوخۆ بونياد بنێ***

*- وەزيری پەروەردە (ناوەكەی)، تەواوكردنی پلانە پەروەردەييە نوێيەكەی راگەياند/پلانەكە جەخت لە سەر پتەوكردنی پەيوەندی نێوان زانكۆ و دامودەزگاكانی وەزارەتی پەروەردە دەكات/وەزيری نێوبراو ئەوەشی روون كردەوە.....*

**٤/ خۆت لە رستەی بە سەیەر یەك دادراو و ئیعتیرازی بە دوور بگرە**

بۆ ئەوەی تێکستەکە ناکۆك نەبێ لەگەڵ بنەماکەی پێشوو، هەوڵ بدە رستەکانت درێژ و بە سەریەك دادراو نەبن، خۆت لەو دەستەواژانە بە دوور بگرە کە دەبنە دروست کردنی ئەو جۆرە رستەیە، وەك“ (کە بووە هۆی، ئەو، کە،...تاد)، چونکە سیغەی ئیعتیرازی و درێژ دەبێتە مایەی لە دەست دان یان بزربوونی بەشێك لە ماناکان.

- ***لە رستەی بەسەر یەك دادراو دووریکەوە:***

*- لە بری ئەوەی بنووسی: وەزیری دەرەوە (ناوەکەی) کە دوێنێ لە سەردانێکی سێ رۆژی لە فەرەنسا گەڕایەوە، ئەمرۆ بڕیاری کردنەوەی قونسڵخانەی....*

*- بنووسە: وەزری دەرەوە (ناوەکەی)بڕیاری کردنەوەی قونسڵخانەی ....دا، ناوبراو دوێنێ دوای سەردانێکی سێ رۆژی لە فەرەنسا گەڕایەوە....*

**٥/ ناوەڕۆکی بابەتەکە لە گەڵ ئەوەی دەیڵێیت، جیا مەکەوە:**

با ئەوەی دەیڵێیت هاوڕێك بێ لە گەڵ ناوەڕۆکی بابەتەکە، ئەم بنەمایە بە بنەمایەکی گرنگی سیاغەی رادیۆیی و تەلەڤزیۆنی دادەندرێت، یارمەتی رۆژنامەنووس دەدات ماناکە بە روون و ئاسانی بگەیەنێتە وەرگر.

لە رادیۆ و تیڤیدا، وەرگر چانسی ئەوەی نییە دووبارە بگەڕێتەوە سەر نووسینەکە، وەك ئەوەی لە خوێندنەوەی رۆژنامەیەکدا بۆی دەڕەخسێت، بۆیە دەبێ تێکستەکان هێندە روون و بێ گرێ بن، وەرگر بە ئاسانی وەریان بگرێت.

- ***ناوەڕۆك و سیاغە لە یەگدی دوور مەکەرەوە:***

*- مەنووسە: لە سەر ڕاسپاردەی ئەنجوومەنی وەزیران، هێزەکانی ناوخۆ، ئۆپراسیۆنێکیان لە باکووری پایتەخت ئەنجام دا....*

*- بنووسە: هێزەکانی ناوخۆ ئۆپراسیۆنێکیان لە باکووری پایتەخت ئەنجام دا/ ئۆپراسیۆنەکە لە سەر ڕاسپاردەی ئەنجوومەنی وەزیران هات....*

تێبینی بکە لێرە ئەنجامدانی ئۆپراسیۆنەکە لە لایەن هێزەکانی ناوخۆوە لە گەڵ شوێنەکەی کە باکووری پایتەختە، یەك شتە، ڕاسپاردەکەی ئەنجوومەنی وەزیران ناچێتە نێو ئەو ناوەڕۆکەوە، بۆیە ڕاستر ئەوەیە نەخرێتە نێو ناوەڕۆکی شتە ئەساسییەکە.

**٦/ لە دووبارە کردنەوە مەترسە:**

وەك ئاماژەمان پێدا وەرگر لە ڕادیۆ و تیڤیدا چانسی گەڕانەوەی بۆ تێکستەکان نییە، بۆیە واباشە میدیاکار چەندی پێی دەکرێت ئسلوبی دووبارەکردنەوە لە سیاغەی نووسین بەکاربێنێ، هەروەها با سیفەت و ئەلقابیش بە کەس و شتەکان بدات، بە تایبەت ئەوانەی لای وەرگر ناسراون.

ئسلوبی دووبارە کردنەوە، یارمەتی گەیاندنی ناوەڕۆکی پەیامەکە باشتر دەدات، ڕستەکان کورت دەکات، و نووسینەکە لە ڕستەی بەسەر یەك دادراو دوور دەخاتەوە، هەروەها یارمەتی جێگیر کردنی ئەو ناو و ئەلقابانەش دەدات گەر لە کاتی خوێندنەوەی بابەتەکە بەسەر وەرگر تێپەڕ بووبن.

* ***سڵ لە بە کارهێنانی ئسلوبی دووبارە کردنەوە مەکە***

*- تایەر تۆفیق بە مانای وشە ناوازە و بەهرەمەند بوو/هونەرمەندی گەل هیچ لایەنێکی ژیان نییە گۆرانی بۆ نەچڕی بێ.*

*- نەخۆشی لەدەستدانی بەرگری لەش ساڵانە ملیۆنەها کەس دەکاتە قوربانی/ئایدز بە ئافات و تاعونی ئەو سەدەیە دادەندرێت...*

*- وەزیری خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی (ناوەکەی) پرۆژەی بەرنامەی تواناسازی لاوانی راگەیاند/ پرۆژەکە بە پلەی یەکەم بۆ...*

## ٧/ هەوڵ بدە لە دارشتندا بیردانی وەرگر بەرەو پێشەوە ببەیت:

ئەم بنەمایەش پەیوەندی بە توانای نەگەرانەوەی وەرگر هەیە بۆ پەیامەکە، بۆیە لە سیاغەدا دەبێ ئەو کردار و دەستەواژانە بەکار بێت کە زاکیرەی وەرگر بەرەو داهاتوو، واتە پێشەوە دەبەن.

هەوڵ بدە وا لە وەرگر بکەیت چاوەرێ بکات رستەکانی داهاتوو چی پێدەگەیەنن، نەك دەستەواژەی وەك" (ناوبراو،و وەك ئاماژەمان پێدا، و لە سەرەتا گوتمان...تاد) بە کار بێنی، کە بیردانی وەرگر بۆ رابردوو، دواوە دەگەرێننەوە.

بۆ ئاراستەکردنی زهنی وەرگر بەرەو داهاتوو، دەکرێ دەستەواژەی وەك" (لە داهاتوودا، وەك پاش کەمێکی دیکە دەیبینین، بریتین لە، هەروەها بەکار هێنانی بکەر لە دەمی رانەبردوو) بەکاربێنیت.

* ***وا له بینەر یان بیستەر بکە چاوەڕێ بکات چی ڕوودەدات:***

*- مەنووسە: وەك له نموونەی پێشوو بینیمان، دەبێ بە وریاییەوە مامەڵە....*

*- بنووسە: سەرەتای کێشەکە لە ناوچەی هەورامان دەستی پێکرد، وەك لە داهاتوودا دەیبینین (ناو) تەنها کەس نییە لەو کێشەیە....*

*- بنووسە (فلان) لە وتارەکەیدا جەختی لە سەر فاکتەرەکانی سەرکەوتنی پرۆژەکە کرد، (فلان) دەڵێت:...../ئەو سیاغەیە هانی وەرگر دەدات موتابەعەی داهاتوو بکات لە سەر زاری قسەکەرەکەوە.*

*- بنووسە: لێکۆڵینەوەکەی زانکۆی (هارفارد) جەخت لە سەر دوو بنەمای سەرەکی دەکات لە شیکردنەوەی بۆ بەرزبوونەوەی پلەی گەرمای زەوی..../ئەو سیاغەیە زهن و بیردانی وەرگر بۆ داهاتوو رادەکێشێت، فزوڵی ئەوەی لا دروست دەکات گوێ بیستی دوو بنەماکە بێ.*

## ٨/ خۆت لە ئاڵۆزی و داڕشتنی لاواز بە دوور بگرە:

نووسینی ڕۆژنامەوانی بە گشتی نووسینێکی سادەیە، لە ڕادیۆ و تیڤیدا سادەترە، ئاڵۆزی دوژمنی نووسینی میدیاییە، ڕۆژنامەنووس تا پێی دەکرێت دەبێ خۆی لە ئاڵۆزی و وشە و دەستەواژە تووند و قورسەکان بە دوور بگرێت. واباشە کەمترین وشەی بیانی بە کاربهێنێت، تەنها لە کاتی زۆر پێویستدا پەنایان بۆ ببات، وەك ناوهێنانی ئاژانسە هەواڵی و سەنتەرەکانی لێکۆڵینەوە...تاد.

سادەیی تێکستە رۆژنامەوانییەکان بەو مانایە نییە لاواز و نامەفهوم بن، بەڵکە بەو شێوازە بن هەموو کەسێك لە تەعبیر و دەستەواژەکانیان تێبگات، کورت و سەرنج راکێش بن.

لە کاتی دارِشتنی رادیۆیی و تەلەڤزیۆنیدا، پێویستە رەچاوەی ئەوە بکرێت پیت و وشە قورسەکان وەك" (س و ش.. تاد) لە تەنیشت یەك نەنووسرێن چونکە لەکاتی دەربرِیندا ئاڵۆزی و هەڵە بۆ بێژەر دروست دەکەن.

- ***ئاگاداری ئاڵۆزی و بە کارهێنانی وشەی بێگانە بە:***

*ئاگاداری خوێندنەوەی: (لە پەیمانگای ماساشوتس ٣ ساڵ خوێندوویەتی)بە.*

**٩/ لە هەندی حاڵەتدا دەتوانی موخاتەبەی وەرگر بکەیت:**

سەرجەم نووسینە میدیاییەکان لە یەك لەو دوو ئسلوبە پێك دێن، یەکەمیان: شێوازی نادیار (مجهول)، دووەمیان: شێوازی موخاتەبەکردن. هەر کامێکیان بەکار بێت ئاسایی و دروستە، بەڵام لەو بابەتانەی باس لە خزمەتگوزاری دەکەن، یان ئەوانەی رێنمایی بە جەماوەر دەبەخشن، دەتواندرێ ئسلوبی موخاتەبە، قسەکردن لە گەڵ وەرگر بە کار بێت.

- ***لە بابەتە خزمەتگوزارییەکان قسە لەگەڵ وەرگر بکە:***

*-بڵێ: پیازەکە بخە ناو رۆنەوە، ئینجا لەسەر ئاگرێکی لە سەرخۆی دابنێ....*

**١٠/ خۆڕسك و عەفەویانە هەڵسوكەوت بكە:**

سادەیی و خۆڕسكی میدیاكار، كلیلی سەركەوتن و نزیك بوونەوەیەتی لە جەماوەر، خۆڕسكی یارمەتی دەدات پەیامەكان ئاسان و لە سەرخۆ بگەیەنێتە وەرگر.

خۆڕسكی میدیاكار دەبێ لە هەڵسوكەوت و قسەكردنی، لە كاتی پێشكەش كردنی بەرنامەكان و مامەڵەكردنی لەگەڵ میوانەكان رەنگ بداتەوە، عەفەویەت بۆ كاتی هەڵەكردنیش زۆر پێویستە، دەبێ نەشڵەژێ و بزانێ چۆن بە هێمنی هەڵەكە راست دەكاتەوە.

## نووسین لە میدیای بینراوی كوردستانی

لە كوردستان، میدیای خوێندراو لە رووی ناوەڕۆك و داڕشتننەوە، لە میدیای بینراو و بیستراو پێشكەوتووترە، تا ئێستا میدیای بینراوی كوردی لە بڵاوكردنەوەی هەواڵ و بابەتە تەلەفزیۆنیەكاندا تایبەتمەندی بە نووسینی tv نەداوە، بەهەمان نەفەس و ستانداردی داڕشتنی میدیای نووسراو، هەواڵ و بابەتەكانی پەخش دەكات.بە تێگەیشتنی من فاكتەرە هەرە دیارەكانی ئەم حاڵەتە دوو هۆكاری سەرەكین:یەكەمیان پشتبەستنی tv كوردی بە رۆژنامە و سایتە ئەلیكترۆنیەكان وەك سەرچاوەی سەرەكی هەواڵ و راپۆرتەكانی.دووەم: لاوازی ژوورەكانی نووسینی هەواڵ لە تەلەڤزیۆنەكان بەهۆی ناپیشەگەری و نا ئەكادیمی كارمەندانی ئەو بەشانە، و زاڵبوونی باكگراوندی ستایلی داڕشتنی میدیای نووسراو بەسەریاندا.

لە میانی موتابەعە و چاودێریكردنی بەردەوامم بۆ هەواڵ و بابەتی تەلەفزیۆنەكانمان (حزبی و ئەهلی) ئینجا شیكردنەوەیان لەژێر هاوێنەی ئەو بنەما ئەكادیمیانەی ئاماژەمان پێدا، كە پێویستە لە نووسینی تەلەفزیۆنیدا هەبن، كۆمەڵێك تێبینی و سەرنجم لا گەڵاڵە بوو، لێرەدا دەیانخەمە روو:

- زۆربەی هەرە زۆری هەواڵ و راپۆرتە هەواڵی تیڤییە کوردییەکان درێژ و دووبارەن، تێکستەکان وەك خۆیان چۆن لە سایت و رۆژنامەکان وەرگیراون، بڵاودەکرێنەوە، لەکاتێکدا دەبێ هەواڵی تیڤی هەواڵی کورت و واتا بەخش بێ، دەنگ و وێنە بەیەکەوە گوزارشت لە ناوەڕۆکی مەسژە ئیعلامییەکە بکات، ئەوەی بەوێنە نیشان دەدرێت نابێ لەهەواڵەکەدا دووبارە بکرێتەوە.

- دەستەواژە و رستە بەکارهێندراوەکان درێژ و ئاڵۆزن، یان دەنگ و پیتی وایان تێدایە قورسن لەسەر زاری بێژەرەکە و زۆرجار دەبنە هۆکاری هەڵەکردن و رێك دەرنەبڕینی پیتەکان، درێژدادڕی لە نووسینی تیڤیدا دوژمنی هەواڵە چونکە هۆکارێکە بۆ سەر لێشێوان و کۆنترۆڵنەکردنی مەفهوم و ئامانجی هەواڵەکە، پێویستە نووسینی تەلەڤزیۆنی نووسینێکی بروسکەیی تیژ و پڕ واتا بێ، رستەکانی راستەوخۆ و کورت بن، چونکە وەك ئاماژەمان پێدا لە تیڤیدا بە پێچەوانەی رۆژنامەگەری نووسراو، بینەر هیچ چانسێکی نییە بۆ دووبارە گەڕانەو بەسەر ئەوانەی کە تێیان ناگات، یان نا روون و ئاڵۆزن.

- تیڤی کوردی بەگشتی رۆژانە هەڵەیەکی زۆر باو دووبارە دەکاتەوە ئەویش خوێندنەوەی ژمارە و داتاکانە بە دوور و درێژی وەك خۆیان، بۆ نموونە گەر داتایەك لە شەش ژمارە پێك هاتبێ (٤٦٥٨٩٢) لە داڕشتنی هەواڵەکەدا ئەو ژمارەیە وەك خۆی بۆ بێژەرەکە دەنووسرێتەوە.

- بەردەوام لە هەواڵی تەلەڤزیۆنەکان تێبینی بەکارهێنانی دەستەواژەی (ناوبرا و گوتی، یان وەك ئاماژەمان پێدا)دەکەم، لەراستیدا بەکارهێنانی دەستەواژەی لەمجۆرە لە داڕشتنی تەلەڤزیۆنیدا هەڵەیەکی رۆژنامەوانی گەورەیە، چونکە وەك لە بنەماکان ئاماژەمان پێدا، زەمەن لەو شێوە نووسینەدا دەبێ بەردەوام زاکیرەی بینەر بەرەو داهاتوو ببات نەك بۆ رابردووی بگەڕێنێتەوە، بەو پێیەی وەرگر پانتاییەکی ئەوتۆی لە بەردەمدانییە تا بزانێ (ناوبرا و کێیە، یان بێژەرەکە پێشتر ئاماژەی بە چی داوە).

- زۆرجار بەهۆی بەکارهێنانی راستەوخۆی هەواڵ و راپۆرتە وەرگیراوەکان لە رۆژنامەو گۆڤارەکان، تەلەڤزیۆنەکان ئیقتیباس و لێدوانەکان بە دوورو درێژی بێ

کورتکردنەوە بۆ بینەر دەگوازنەوە، ئەم حاڵەتە لەو لێدوانە ڤیدیۆییانەش دووبارە دەبێتەوە کە tv خۆی لە کەسێکی وەرگرتووە، لە کاتێکدا لەرووی زانستییەوە نابێ هیچ لێدوان و وەرگێراوێکی بەکار هاتوو لە نێو هەواڵەکان ماوەکەی لە دەقەیەك درێژتر بێ.

چارەسەرکردنی ئەو هەڵەو کەموکوڕیانە دەخوازێ تەلەڤزیۆنەکان بایەخ بە ژوورەکانی نووسین بدەن، لەرێگەی خولی تایبەتەوە نووسەرانی ئەو بەشانە لەسەر بنەما زانستییەکانی نووسینی هەواڵی تەلەڤزیۆنی رابهێنن، و ئەوەیان بۆ روون بکەنەوە نووسینی تەلەڤزیۆنی تێکەڵەیەکە لە دەنگ و وێنە، جیاوازە لە داڕشتنی هەواڵی رۆژنامە و سایتە ئەلیکترۆنییەکان دوای هەموو ئەوانە، دەکرێ بڵێین" نووسینی رادیۆیی و تەلەڤزیۆنی ئەگەر چی پێوەرەکانی بڵاوکردنەوە و توخمەکانی نووسینی هەمان پێوەر و توخمی میدیای خوێندراوە، وەلێ لە رووی داڕشتنەوە خسوسیەتی خۆی هەیە، دەبێ بیردانی وەرگر بەرەو پێشەوە، داهاتوو ببات، نووسینێکە حەز لە دووبارەکردنەوە دەکات، وەرگر ناتوانێ بگەڕێتەوە سەری.

# بەشی هەشتەم

## دەنگو باس لە TV و رادیۆدا

پێکهاتەی دەنگوباس

لە نێوان بڵاوکراوەیەکی هەواڵی و یەکێکی دیکەدا

وەزیفەی کارمەندانی رادیۆ و تیڤی

هەیکەلی بڵاوکراوە هەواڵییەکان

پەخش کردن

دەنگوباس یان هەواڵەکان، ئەو چالاکی و ڕووداوانەن کە ڕوویان داوە و جەماوەر مەبەستییەتی بیانزانێ.[1]
یان بریتییە لە چەند بڕگەیەك، لە ڕێگەی ژانرە ڕۆژنامەوانییە جیاجیاکانەوە، ڕۆشنایی دەخاتە سەر گرنگترین ڕووداو و دیاردەکانی زەمەنێکی دیاریکراو.
دەنگ و باس بابەتی سەرەکی ڕادیۆ و تیڤیە، ئامادەکردن و پێشکەش کردن و جێبەجێکردنی، بنەما و ڕێسای خۆی هەیە، لەم بەشەدا تیشك دەخەینە سەر لایەنە جۆراوجۆرەکانی.

(١) لە زمانی عەرەبیدا (الانباء) بۆ دەنگ و باس و (الاخبار) بۆ هەواڵەکان بەکاردێت، بەڵام لە زمانی ئینگلیزی(News) بۆ هەواڵ و دەنگ و باس بەکاردێت.

## پێکهاتەی دەنگوباس

پێکهاتەکانی دەنگوباس جۆرا و جۆرن، بەڵام بە گشتی بریتین لە هەواڵ و چاوپێکەوتن، دەکرێ لە دوو ژانر زیاتریش پێك بێت، هەندێ جار تەنها هەواڵێکی سادەیە و بێ وێنە، هەندێ جار لێدوان و چاوپێکەوتنیش لەخۆ دەگرێت.

هەواڵی مورەکەب لە رادیۆ و تیڤیدا جێگەی نابێتەوە، چونکە لە رووی زەمەنییەوە زەحمەتە وەرگر ماوەیەکی درێژ بە دیار یەك هەواڵەوە دابنیشێ، لە بری ئەو جۆرە هەواڵە رادیۆ و تەلەڤزیۆنەکان پەنا بۆ بڵاوکردنەوەی کۆمەڵە هەواڵێکی کورت دەبەن، کە بێژەر وەك یەك تێکستی دەیخوێنێتەوە، و هاوبەشیەك لە نێوان سەرەتا و کۆتاییەکەی هەیە.

ئەگەر بڕگە هەواڵیەکە بریتی بوو لە رووماڵ کردن، ئەوا لە هەواڵ و لێدوان و چاوپێکەوتنی کورت پێك دێت، دەکرێ لە مەش زیاتر بێ، واتە لە هەواڵێك و لێدوانێك و چاوپێکەوتنێك و بەدواداچوونێك زیاتر بێ، لەم حاڵەتەدا لە هەریەکەیان توخمێك وەردەگیرێت.

بڕگە هەواڵییەکە هەر چۆنێك بێ، دەبێ پێشەکییەکەی وا سەرنج راکێش و پتەو بنووسرێت، بێژەرەکە لە کاتی خوێندنەوەیدا هیچ زانیارییەکی نێو پێکهاتەی هەواڵەکە نەدرکێنێ، یان دووبارەی نەکاتەوە، تەنها ئاماژە بۆ لایەنەکانیان بکات نەك ناوەڕۆکیان.

بۆ نموونە، گەر میحوەری سەرەکی هەواڵەکە ئیمزا کردنی رێکەوتنامەیەك بوو لە نێوان دوو وڵات، دەکرێ بڕگە هەواڵەکە، هەواڵی پێشوازی کردن لە وەفدی وڵاتی میوان، روماڵی مەراسیمی ئیمزاکردن، هەواڵی سەردانی خێزانی سەرۆکی شاندەکە بۆ دەزگا خێرخوازییەکان، بەدواداچوونێك دەربارەی رەوەندی شاندی میوان لەو وڵاتە، و چاوپێکەوتن لە گەڵ شارەزایەکی ئەو بارە بۆ هەڵسەنگاندنی ئاسەوارەکانی رێککەوتننامەکە، لەخۆ بگرێت، لێرەدا بڕگە هەواڵەکە سنووری هەواڵێکی سادە دەبەزێنێ و دەبێتە هەواڵێکی مورەکەب و رووماڵ کردن، واباشە چاوپێکەوتنەکەش راستەوخۆ بێ، ئێستا تیڤییە جیهانییەکان هەرگیز پەنا بۆ

چاوپێکەوتنی تۆمارکراو نابەن، هەوڵ دەدەن چاوپێکەوتنی نێو هەواڵەکان زیندوو و راستەخۆ بن.

تێکستی بێژەریش (واتە ئەوەی دەیخوێنێتەوە) تەنها ئاماژەی سەرەتایی بە ناوەڕۆکی بڕگەکە دەدات، و سەرنجی خوێنەری رادەکێشێت.

- ***تێکستی بێژەر پێکهاتەکانی نێو بڕگەکە بە یەکەوە گرێ دەدات:***

*ئەمڕۆ لبنان رێکەوتنامەیەکی گرنگی لە گەڵ عێراق مۆرکرد/رێککەوتنەکە نەوتییە بەڵام کاریگەری لە سەر تەواوی کەرتی ئابووری دەبێت... (دوای ئەو تێکستە رومالی مەراسیمی مۆرکردنەکە دادەبەزێ)*

*وەفدەکەی عێراق هەندێکیان خەریکی مۆرکردنی رێکەوتنامەکە بوون، هەندێکی دیکەیان سەرقاڵی چالاکی مرۆیی/ خێزانی سەرۆکی شاندەکەی عێراق چەند دامودەزگایەکی مرۆیی لە بەیروت بەسەر کردەوە... (دوای ئەو تێکستەی بێژەر چالاکییەکانی ئەو خانمە بڵاودەکرێتەوە)*

*پەیوەندی نێوان عێراق و لبنان پەیوەندییەکی کۆنە هەموو لایەك ئەوە دەزانێ/ بەڵام ئەوەی هەموو خەڵك نایزانێ بوونی عێراقی دووەمە لە لبنان بەهۆی ژمارەی زۆری رەوەندی عێراقی لەو وڵاتە کە زۆربەی بە کاری بازرگانییەوە خەریکە... (دوای ئەو تێکستە بەدواداچوونێك لە گەڵ رەوەندی عێراقی دادەبەزێ)*

هەندێك تەلەڤزیۆن بڕگەیەکی مۆسیقی، یان رێکلامێکی بازرگانی یان رێکلامی بەرنامەکانیان دەخەنە نێو دەنگوباسەکان، بە تایبەت دوای تەواو بوونی هەواڵێکی

درێژ، یان کۆتایی هاتنی تەوەرێك  و چونە سەر تەوەرێکی دیکە، وەك کۆتایی هاتنی تەوەری هەواڵە نێوخۆییەکان.

هەندێك رادیۆش ئەمە دەکەن، وەك لە بەشی رابردوو ئاماژەمان پێدا، بەڵام بەگشتی بۆ بەستنەوەی برگە و تەوەرەکان بە یەکتری، تێکستێکی عەفەوی دادەندرێت کە پەیوەندی بە دوابەشی هەواڵە کۆتایی هاتووەکە و دەستپێکی هەواڵە تازەکە هەیە.

- *عەفەویت زامنی راگوزاری هێمنە لە برگەیەك بۆ یەکێکی دیکە:*

***- لە نەوت و دونیای دراوەوە بۆ دونیای هونەر/ ئەمڕۆ لبنان گردبوونەوەیەکی هونەری گەورەی بەخۆوە بینی... (لێرە پێشکەشکار دەنگویاسەکە لە هەواڵی رێکەوتنامەکەی نێوان عێراق و لبنان بۆ هەواڵێکی هونەری دەگوازێتەوە)***

دەکرێ تێکستی بێژەر ئاماژە بە هەندێك زانیاری بدات، بە مەرجێك لە نێو هەواڵەکە نەهاتبێت، بۆنموونە ئەگەر هەواڵەکە بریتی بوو لە کردنەوەی پێشەنگایەك، دەشێ بێژەر لە تێکستەکە ئاماژە بە ماوە و کاتی بدات.

دەشبێ هەندێك جار تێکستی بێژەر هەواڵێکی تەواو بێ و هەمووی بخوێندرێتەوە، یان ئەو پرسیارانە بێ کە لە میوانی دەنگ و باسەکە دەکرێت، جۆری پرسیارەکانیش بە پێی میوانەکە دەگۆڕێت، ئایا میوانەکە دروستکاری رووداوە یان گەواهیدەر یان پسپۆر...تاد.

## له نێوان بڵاوكراوەیەكی هەواڵی و یەكێكی دیكەدا

هەر بڵاوكراوەیەكی هەواڵ لە رادیۆ یان تیڤی وەك ژمارەی دەرچوونی رۆژنامە و گۆڤارەكان وایە، دوا ئامانج و هەوڵی كادیرانی دەزگاكەیە. ماوەی نێوان بڵاوكراوەیەكی هەواڵی لە گەڵ یەكێكی دیكە، ئەو ماوە زەمەنییەیە كە دەكەوێتە نێوانیان، بە زۆری ٢٤ كاژێرە، بە تایبەت لەو رادیۆ و تیڤیانەی هەواڵی نین، و دەنگوباس و بابەتە سیاسییەكان بەشێك لە بەرنامەكانیان پێك دێنن نەك هەمووی، بەڵام لە تیڤی و رادیۆ هەواڵییەكان، بڵاوكراوەی دەنگوباس لە ماوەی ٢٤ كاژێردا چەند جارێك (هەموو سەرە كاژێرێك دووبارە دەبێتەوە)، لە گەڵ هەر بڵاوكراوەیەك هەواڵ و زانیاری نوێ ئیزافە دەكرێت، هەروەها رووماڵی هەواڵ و رووداوە لە ناكاو و بە پەلەكانیش دەكرێت.

كورتەی هەواڵەكانیش جۆرێكە لە بڵاوكراوەی هەواڵی، لە چەند سەردێڕێكدا گرنگترین رووداوەكانی ماوەیەكی زەمەنی دیاریكراو دەگەیەنێ.

لە تیڤیە گشتییەكان، چەند كاتێكی دیاریكراو لە ماوەی ٢٤ كاژێر بۆ بڵاوكراوە هەواڵییەكان داندراوە، لەوانەیە كاتەكان، بەیانی و دوای نیوەڕۆ و شەو بن، بەڵام بە شێوەیەكی گشتی، لە هەردوو جۆردا، تیڤییە گشتی و هەواڵییەكان درێژترین و فراوانترین بڵاوكراوە دەخەنە كاتی شەوەوە، لەبەر دوو هۆی سەرەكی، یەكەمیان: تا ئەو كاتە زۆرترین رووداو هەواڵ و كاردانەوەكان بە دیار دەكەون، دووەمیان: شەو كاتی پشوودان و دانیشتنە لە ماڵ، وەرگر لە هەموو كاتێك زیاتر ماوەی موتابەعەكردنی هەواڵەكانی بە دوور و درێژی هەیە.

بڵاوكراوەی هەواڵەكانی رادیۆش بە پێی كاتی وڵاتەكان دەگۆڕێت، بەڵام پڕجەماوەرترین دەنگوباس، هەواڵەكانی بەیانیان و نیوەڕۆیانە، ئەوەش بە هۆی پەیوەندی رادیۆ بە جووڵەی رۆژانەی مرۆڤ، و سروشتی رادیۆ كە لە كاتی كاركردن و لە نێو ئۆتۆمبێل و ...تاد، دەتواندرێ گوێی لێبگیرێت.

## وەزیفەی کارمەندانی رادیۆ و تیڤی

له رادیۆ و تیڤیش، هاوشێوەی بڵاوكراوەكان، زۆربەی كارمەندان بەشدارن له بەرهەم هێنانی بڵاوكراوه هەواڵییەكان.

ئەرك و بەرپرسیارییەتی كارمەندان له بڵاوكراوەكان، له رووی دەرهێنان و نووسینەوە، كەمێك له ئەركی كارمەندانی ئێستگه و تیڤییەكان جیاوازترە، بەرپرسانی هەواڵەكان گەورەترین دەسەڵاتی رادیۆ و تیڤین، ئینجا سەرنووسەری بڵاوكراوه هەواڵییەكان.

بەرپرسی هەواڵەكان له رادیۆ و تیڤی، وەك سەرنووسەری رۆژنامه و گۆڤارەكان وایە، هەمان ئەرك و بەرپرسیارییەتی هەیە، ئەركی سەرنووسەری بڵاوكراوەكەش بریتی دەبێ له ئامادەكردن و هەماهەنگی دروست كردن له گەڵ بەرپرسی بەشەكان.

هەندێك رادیۆ و تەلەڤزیۆن سكرتێری نووسینیشیان هەیە، ئەركی بریتییه له هاریكاریكردنی سەرنووسەری هەواڵەكان و پێداچوونەوەی نووسینەكان، یان جێگرتنەوەی سەرنووسەر له كاتی ئامادەنەبوون و سەرقاڵیدا.

ستاڤی هەواڵ له رادیۆ ژمارەیان كەمە، چەند كەسێكی دیاریكراون، لەوانەیە دوو تا سێ كارمەند بن، بەڵام له تیڤیدا یەك سوپایە، له ده كەس زیاترە، به تایبەت ئەگەر كارمەندانی بەشی هونەریشمان ئەژمار كرد.

بەشی تەكنیك، بەشێكی سەرەكی تیڤییه، له هەندێك دەزگادا به بەشی بەڕێوەبردنی بەرهەم ناودەبرێت، بایەخ به سەرجەم لایەنی تەكنیكی بەرهەم هێنانی بڵاوكراوه هەواڵییەكان دەدات، وەك دابین كردنی كامێرا و كامێرامان و ئامێری مۆنتاژ و پسپۆرانی وێنەی كۆمپیوتەری (گرافیكس) و تۆتۆمبیلی پەخشی راستەوخۆ و بەرزكەرەوەی كامێرا و هەماهەنگی كردن لەگەڵ بەڕێوەبەری نووسینی هەواڵ.

ئەرشیفیش رۆڵی زیندوو له هەواڵی تەلەڤزیۆنی دەبینێ، چونكه زۆربەی بابەتەكان پێویستیان به فۆتۆ هەیە، و وێنه توخمی سەرەكی كاری تەلەڤزیۆنییه.

## هەیکەلی بڵاوکراوە هەواڵییەکان

ئامادەکردنی دەنگوباس بۆ رادیۆ زۆر ئاسانترە لە ئامادەکردنی بۆ تەلەڤزیۆن، چونکە تەنها پێویستی بە نووسین و خوێندنەوە و هەماهەنگی کردن لە گەڵ بەشی (تەنسیق) هەیە، هەموو ئەمانەش کەسێك یان دوو کەس دەتوانێ ئەنجامی بدات.

هەواڵەکان وێستگەی سەرەکی بەرنامەکاتی تیڤی و رادیۆن، لە رووی ناوەڕۆك و دەرهێنانەوە بایەخی زۆری پێدەدرێ و لە بەرەو پێشڤەچوونی بەردەوامە، لە تیڤیدا ئامادە و پێشکەش کردنی هەر دەنگوباسێك وەك دەرهێنانێکی تەلەڤزیۆنی زەبەلاحی لێهاتووە، سوپایەك لە میدیاکار و تەکنیککاران شەڕ لە گەڵ زەمەن دەکەن بۆ بەرهەم هێنانی.

## هەر بڵاوکراوەیەکی هەواڵیش لەم توخم و قۆناخانە پێك دێت:[1]

- **هەڵبژاردنی بابەتەکان:** هەڵبژاردنی بابەتی هەواڵەکان پەیوەنداری چەند شتێکە، لەوانە" سەرچاوە هەواڵییەکانی دەزگاکە (ئاژانسەکان، پەیامنێران،...تاد)، پێوەرەکانی بڵاوکردنەوە، سیاسەتی رۆژنامەوانی دەزگاکە، و توانا تەکنیکییەکانی .

- **هەرەمی بڵاوکراوەکە:** بڵاوکراوە هەواڵییەکانی رادیۆ و تیڤی لە بڵاوکردنەوەی ناوەڕۆکی هەواڵەکان هەمان هەرەمی پەیڕەوکراوی رۆژنامە و گۆڤارەکان پەیڕەو دەکەن، چۆن ئەو بڵاوکراوانە بە هەواڵ و بابەتی سیاسی دەست پێدەکەن ئینجا ئابووری و کۆمەڵایەتی و وەرزشی و هونەری و...تاد، بڵاوکراوە دەنگوباسیەکانیش کار بە هەمان ریزبەندی دەکەن.

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، نەسیم خوری، ١٢٣- ١٢٥.

هەڕەمی بڵاوکراوە ئەو ریزبەندییەیە کە نۆرەی دابەزاندنی بابەتەکان ڕێك دەخات، واتە یەکەم هەواڵ چی دەبێ، و دووەمیش کام هەواڵ، ئینجا سێیەم و چوارەم و تا کۆتایی.

جۆری هەواڵ و گرنگییەکەی، ریزبەندی لە لیستی بڵاوکراوەکە دیار دەکەن، هەندێ هەواڵ خۆی خۆی فەرز دەکات، گرنگی و تازەییەکەی وادەکات ببێتە هەواڵی سەرەکی دەنگوباسەکە، بەڵام گەر چەند هەواڵێکمان هەبوو و هەموویان لە رووی گرنگییەوە لێك نزیك بوون، ئەوا شێوەی هەڕەمی سەرەوژێرکراو بۆ ریزبەندکردنیان پەیڕەو دەکەین.

سەرباری هەموو ئەوانە، هەندێك جار سیاسەتی ئیعلامی دەزگاکە و خاوەنەکەی رۆل دەبینن لە ریزبەندکردنی هەواڵەکانی دەنگوباسێك، بگرە لە پشتگوێخستنی هەواڵێك و بایەخدان بە یەکێکی دیکە.

هەر بڵاوکراوەیەکی هەواڵیش لە ١٥- ٢٠ مادده پێك دێت، نابێت هەواڵەکان لەو ژمارەیە زیاتر بن، سەرجەمیان بە راوێژ لە نێوان بەرپرسی هەواڵەکان و بەڕێوەبەری نووسین و یەکەی هونەرییەوە ڕێك دەخرێن.

ماوەی دەنگوباسەکانیش بە پێی جۆری کەناڵەکە دەگۆڕێت، لە کەناڵە هەواڵییەکان نزیکەی کاژێرێکە، بەڵام لە کەناڵە گشتییەکان، نیو کاژێرە.

- **ناونیشان، سەردێڕی هەواڵەکان:** پێشکەش کردنی سەردێڕ بە پێی دیکۆر و دەرهێنانی هونەری کەناڵەکە دەگۆڕێت، لە هەندێکیان بێژەرەکە لەگەڵ وێنەی هەواڵەکان دەردەکەوێت، لە هەندێکی دیکەشیان بێژەر دەرناکەوێت، تەنها دەنگەکەی لەگەڵ وێنەکان، بەڵام باشترین جۆری سەردێڕ ئەوەیە کە هەموو توانا تەکنیکییەکانی کەناڵەکە دەخاتە کار واتە" دەنگ و ڕەنگ و کۆمێنت[(١)].

سەردێڕە سەرنج راکێشەکان، باشترین جۆری ناونیشانەکانی دەنگوباسن، پێویستە تەنها ئاماژەیەکی لاوەکی بۆ ناوەڕۆکی هەواڵەکە بکات نەك ناوەڕۆکەکە بدرکێنێ.

---

(١) بەشێك لە تەلەڤزیۆنەکانی ئەوروپا، وەك کەناڵی( یورو نیوز) هەواڵەکان بێ بێژەر پەخش دەکەن، بڕگەکانی دەنگوباس بریتیین لە وێنەی هەواڵی و کۆمێنتی کورت ، لە نێوان بڕگەکانیشدا ناوبڕێـکی کورتی مۆسـیقی دادەنێن.

له شێوازە باوەکانی سەردێڕ، دانانی دیکۆرێکی جێگیرە بۆی، لە گەڵ خوێندنەوەی لە لایەن بێژەر و دانانی کۆمێنت و وێنە لەگەڵ دەنگی بێژەرەکە.[1]

- ***بەکارهێنانی دەنگ و رەنگ و کۆمێنت لە سەردێڕدا،*** *مانای دەوڵەمەندی بابەتەکە دەگەیەنێت:*
- *بێژەر: ئەمڕۆ وەزیری دارایی بودجەی ساڵی نوێی راگەیاند./ کۆمێنتی نووسراوی سەر شاشە بە قەبارەیەکی بەرچاو/ وێنەیەك گوزارشت لە پرۆسەی دامەزراندن لە دامو و دەزگاکانی حکومەت بکات.*

*بێژەر: تەنها ٪١٠ بودجەی ئەمساڵ بۆ دامەزراندن تەرخان کراوە/ کۆمێنتی سەر شاشە: بودجەکە رەوانەی پەرلەمان دەکرێت/ وێنەی پرۆسەی دامەزراندن یان فۆرمی دامەزراندن.*

- **کۆبوونەوەی دەستەی نووسین:** ئەم کۆبوونەوەیە بۆ دیاریکردنی بابەتەکانی بڵاوکراوە هەواڵیەکەیە، عادەتەن لە ماوەی بیست و چوار کاژێردا دووجار گرێ دەدرێت، یەکەمیان بە یانیان، ئەوی دیکەیان لە ئێوارەدا، لە کۆبوونەوەی بەیانیدا بەڕێوەبەری نووسین و نووسەران و بەشی دەرهێنان بەشدار دەبن، ئێوارانیش کاژێرێك بەر لە ماوەی دەنگوباسەکان، کۆبوونەوەی دووەم دەکرێت، بچووك و ماوە کورتە، تەنها بەڕێوەبەری نووسین و هونەری بەشدار دەبن، بابەتە سەرەکییەکانی دەنگوباس دەسنیشان دەکەن، لەگەڵ هەڕەمەکەی، ئەگەر هیچ گۆڕانکاری و پێشهاتی نوێ روینەدا، هەواڵە دەسنیشان کراوەکان بڵاو دەکەنەوە.

---

(٢) لە لبنان زۆربەی تەلەڤزیۆنەکان سەردێڕی هەواڵەکان بە وتارێك پێشکەش دەکەن، کە لە لایەن بەڕێوەبەری نووسینی تەلەڤزیۆنەکەوە دەنووسرێ، تیایدا بە شێوەیەکی پانۆرامی، سەرجەم هەواڵەکان لەو تێکستە دەخرێنە روو و جۆرێك لە تەعلیق لێدانیش لە خۆدەگرێت، بەشێوەیەك دارێژراوە پەیوەندی واتایی لە نێوان برگەکانی هەیە، ئسلوبەکەی وا شیرینە، سەرنجی بینەر رادەکێشێت.

ماوەی هەر هەواڵێك، جگە لە دۆسیەی سەرەکی هەواڵەکان، نابێ لە دەقەیەك و نیو تا دوو دەقە زیاتر بێ.

- **خشتەی پەخش کردن:** لە زمانی ئینگلیزی بە (Run Sheet) ناو دەبرێت، هەر کەناڵە و بە شێوەیەك ناوی دەبات، بەڵام ناوەڕۆکەکەی یەکە، بریتییە لەو خشتەیەی سەرجەم بابەتەکانی هەواڵەکان و ماوە و سەرچاوە و وێنە و دەنگیان دیاریدەکات، وەك کۆپی بڵاوکراوەکەیە بەر لە پەخش کردنی.

ئەم خشتەیە پێك دێت لە" ١/ ژمارەی بابەتەکە لە ریزبەندی هەواڵەکان ئینجا ژمارەی پێکهاتەکانی بابەتەکە، بۆ نموونە ژمارە (١) بریتییە لە خوێندنەوەی هەواڵی کۆبوونەوەی ئەنجومەنی وەزیران لە لایەن بێژەرەوە، ژمارە (٢)بریتییە لە روماڵ کردنی کۆبوونەوەکە و بڕیارەکانانی.... .

٢/ناونیشانی بابەتەکە، ئەو ناونیشانە بۆ ئەوە دادەندرێت تا دەرهێنەر و بێژەری هەواڵەکان بزانن کەی بێژەر قسە دەکا و کەی بێدەنگ دەبێ.

٣/سەرچاوەی دەنگ، ئەو ئامێرە دەسنیشان دەکات کە لە کاتی پەخش کردندا دەنگی لێوە دەردەچێت.

٤/سەرچاوەی وێنە، ئەو ئامێرە دیار دەکات کە وێنەکانی لێوە پەخش دەکرێت.

٥/ ماوەی هەر هەواڵێك، تا ئەگەر هەر یەکێکیان لە ماوەی دیاری کراوی خۆی لایدا یەکراست قووت بکرێت.

٦/ماوەی گشتی دەنگوباسەکە، هەندێك ئەو ماوەیە لە کۆتاییەکەیەوە دادەنێن تا دەگاتە دوا چرکە، بۆ نموونە گەر ماوەی گشتی بڵاوکراوەکە ٣٠ خولەك بێ، ژمێرەرەکە لە خولەکی سییەوە بەرەو خوار کاتەکە هەژمار دەکات.

## پەخش کردن

ئامادەکردن و ڕێکخستنی هەیکەلی دەنگوباس ماندوبوون و کاتێکی زۆری دەوێت، کەچی لە بەرامبەردا ئەو هەموو ماندوبوونە لە ماوەیەکی زۆر کورتدا پەخش دەکرێت، ماوەی پەخش کردن بەرامبەر بە ماوەی ئامادەکردن و کۆکردنەوە، کورت و دیاریکراوە، بەڵام ئەنجامی ماندوبوونەکە و ڕێژەی سەرکەوتنی بەرجەستە دەکات.

دەنگوباسە سەرکەوتووەکان ئەوانەن کە وەرگر کاتی پەخش کردنیانی هەزبەر کردووە، ڕۆژانە بە شەوقەوە چاوەڕێی پەخش کردنیان دەکات.

سەرکەوتنی هەر بڵاوکراوەیەکی دەنگوباس تەنها گرێدراوی قۆناخی ئامادەکردن و ڕێکخستنی هەرەمەکەی نییە، بەڵکە قۆناخی پەخش کردنیش پشکی گەورەی لەو سەرکەوتنە بەر دەکەوێت، پەخش کردن میکانیزم و ڕێسای خۆی هەیە، لێرەدا توخمە سەرەکییەکانی دەخەینە ڕوو:

**١/ بێژەر:** بێژەر ڕوو (واجهە)ی کار و ماندوبوونی تیمی ئامادەکردنی هەواڵەکانە، بە گشتی دوو بێژەر (نێر و مێ) پێشکەشی دەکەن، لەو ماوەیەی دوایدا ئاڕاستەیەکی نوێ سەریهەڵداوە ئەوەیش بەشداربوونی چەند میدیاکارێکی دیکەیە بۆ پێشکەش کردنی هەواڵەکانی ئابووری و وەرزشی. دەرکەوتنی ئەو بێژەرانە لەسەر پلاتیۆی پەخش کردن بە شێوەیەکی لاوەکییە، هەندێك کەناڵ وەك میوانی بڵاوکراوەکە مامەڵەیان لەگەڵ دەکەن، بەجۆرێك لەگەڵ هاتنی نۆرەی هەواڵە وەرزشی یان ئابوورییەکان وەك میوان بەخێر دەهێندرێن.

ڕۆڵی بێژەر لە کەناڵێکەوە بۆ یەکێکی دیکە جیاوازە، لە هەندێك کەناڵدا تەنها ڕۆڵی پێشکەشکار نابینێ بەڵکە بەرپرسی هەواڵەکانیشە، لە هەندێکی دیکەش تەنها پێشکەشکار، لە هەموو حاڵەتەکاندا دەبێ بێژەر ئاگاداری گشت قۆناخەکانی ئامادەکردن بێ، هەر لە یەکەم کۆبوونەوە تا پێشکەش کردنی بڵاوکراوەکە، پێویستە بەر لە چوونە سەر شانۆی هەواڵەکان (پلاتیۆ) چەندین جار هەواڵەکانی

خوێندبێتەوە، تەمەشای بڕگە و ڕیزبەندییانی کردبێ، واباشە هەر خۆیشی هەواڵەکانی داڕشتبێ.

دەبێ بە دیقەتەوە سەیری پرسیارەکان بکات، ئەو پرسیارانەی لە نێو بڵاوکراوەکە ئاڕاستەی میوانەکەی دەکات جا لە نێو ستۆدیۆ بێ یان دەرەوەی، هەروەها ئەو پرسیار و حیوارانە هەزبەر بکات کە لەگەڵ پەیامنێران لە شوێنی ڕووداوەکان دەیگۆڕێتەوە، واباشە پێشتر هەماهەنگی لەگەڵیان هەبێ.

بێژەر ڕۆڵی گرنگ لە دروست کردنی پەیوەندی و ڕایەڵە لە نێوان کەناڵەکان و وەرگرانی دەبینێ، زۆر جار جەماوەر بە هۆی بوونی بێژەرێك لە کەناڵێك، موتابەعەی ئەو کەناڵە دەکات، یان بێژەرەکە بەهۆی کەناڵەکەوە ناو و ناوبانگ دەردەکات و دەبێتە ئەستێرە.

دەرکەوتنی بێژەر لە هەواڵەکاندا چەند شێوەیەکی هەیە،  هەر کەناڵە و شێوازێك پەیڕەو دەکات، هەنوکە زۆربەی هەرە زۆریان شێوەی نزیك و زۆر نزیك پەیڕەو دەکەن، واتە تەنها دەرخستنی (سینگ و سەر) ی بێژەرەکە، لەگەڵ بەجێهێشتنی بۆشاییەك لە لایەکی سکریندا بۆ بە دیارکەوتنی ئەو فۆتۆیانەی لە باکگراوندی شاشە دەردەکەون.

بێژەر لە تیڤیدا، ڕێبەری تەماشاکارە بۆ فەزای پان وپۆڕی هەواڵەکان، ئەو بەهۆی شێوازی خوێندنەوە و  جوولە پێکردن و گۆڕینی ئادگاری دەموچاوی، دەتوانێ سەرنجی وەرگر رابکێشێ.

پێویستە جل و بەرگی شیك و سەرنج ڕاکێش بێ، چاکەت و پانتۆڵ بپۆشێ، ڕەنگیان ئەو ڕەنگانە بێ کە لەگەڵ سکرینی تیڤی دەگونجێن، وەك" شین و خۆڵەمێشی[(١)]

(١) لە مەسەلەی جل و بەرگدا، ئەوەی بۆ بێژەر دیاریکراوە پەیامنێران و میدیاکارانی کاری مەیدانی ناگرێتەوە، پێویستە پەیامنێران ئەو جل و بەرگانە لە بەر بکەن کە شیاوی شوێن و جۆری کارەکەیە، بەگشتی جل و بەرگی فەرمی (چاکێت و پانتۆڵ) بۆ پەیامنێران نەگونجاوە،  پەیامنێرانی بیانی زۆر بە دەگمەن لەبەری دەکەن، بەڵام لە کوردستاندا بە پێچەوانەوەیە، پەیامنێرانیش هاوشێوەی بێژەرەکان بەردەوام قات و پانتۆڵیان لەبەرە، ئەوان لە کاتی

تەمەنی بێژەر پێویستە مام ناوەند بێ، واتە نە زۆر گەنج بێ نە زۆر بە تەمەن، ئادگاری گوزارشت لە ئەزموون و باوەڕبەخۆبوون بکات، دەنگی ساف و ڕەوان بێ، دەربڕینی ساخ بێ، لە رووی زمانەوانییەوە شارەزا و لێزان بێ.

بینەری کەناڵەکان، جۆری بێژەر و ڕەگەزەکەی دەسنیشان دەکەن، بەڵام بە گشتی هەردوو رەگەزی نێر و مێ بەکار دێنن. سەبارەت بەو دیالێکتەیش کە هەواڵەکانی پێ پێشکەش دەکرێت، واباشە ئەوە بێ کە زۆرترین جەماوەر حەزی لێدەکەن، ئەگەرنا دەتواندرێ لە ڕێگەی راپرسییەوە جۆرەکەی دیاربکرێت.

**٢/ ژووری کۆنترۆڵ (ریگی):** لە ئینگلیزی بە (Control room) و لە فەڕەنسی بە (Regie) ناو دەبرێت، ئەو ژوورە شوێنی کۆنترۆڵکردنی ئەو ئامێر و کەلوپەلانەیە کە لە کاتی پەخشدا بە کاردێن، دەکەوێتە بەرامبەر پلاتیۆی بڵاوکراوەکە، تەواوی جوڵە و قسەکانی بێژەری بە زیندوویی لێوە دەبیندرێت. ئەو کەسەی کۆنترۆڵی ئەو ژوورەی لە دەستە بە ریگەر ناو دەبرێت، سەرجەم تەکنیککاران، لە ئەندازیاری دەنگ و کامێرامان و کارمەندی ناردنی فۆتۆ و ڤیدیۆکان، لە لایەن ریگەرەوە ئاراستە دەکرێن، دەسنیشانی ئەو وێنە و دەنگانەش دەکات کە دەنێردرێن، ریگەر ئەرکی قورسە، هەر هەڵە و گرفتێك لە کاتی پەخشدا روو بدات، بە خراپی بەسەر کەناڵەکە دەشکێتەوە و ئەو لێی بەرپرسە.

**٣/ ستۆدیۆ:** ستۆدیۆ دوو بەشە، یەکێکیان دیارە و بە شانۆ ناو دەبرێت، ئەوی تریشیان نادیارە، بریتییە لەو وایەر و ستاند و کامێرا و روناکییەی دەرهێنەر لە کاتی پەخش و گواستنەوەدا پێویستی پێیەتی.

ئەو بەشە بە گشتی لە سێ کامێرا پێك دێت لە ناوەڕاست و تەنیشتەکان دادەندرێن، ئەوەی ناوەڕاست بەرەو رووی بێژەر دەکرێت و تەنها وێنەی بێژەر دەگرێت، سکرینێکیشی بۆ خوێندنەوەی هەواڵەکان لەگەڵە، بڕگەکانی بڵاوکراوەکە بە رێك و پیکی نیشان دەدات، دووانەکەی دیکەش بۆ وێنەگرتنی سێگۆشە و میوانەکانە، هەندێك دەرهێنەر کامێرای تەنیشتەکان بۆ چوونە نێو بڕگەیەکی دیکە، یان دوای

---

رووماڵ کردنی رووداوێکی مەیدانی، یان ئامادەکردنی بەدواداچوون و ریپۆرتاژ لە بازاڕ و شوێنە گشتییەکان بە قات و پانتۆڵەوە دەردەکەون، حەزی پەیامنێری کورد بۆ قات و پانتۆڵ حەزێکی سەیرە!!

کۆتایی هاتنی ناوبڕەکان و کاتی گەڕانەوە بۆ ستۆدیۆش بەکار دێنن، واتە لەو حاڵەتانە لە تەنیشتەوە وێنەی بێژەرەکە دەگرن.

دەکرێ هەڵگری کامێراش بەکار بێت، لێرەدا پێویستیمان بە کامێڕای چوارەمە، کە جوڵاوە و بە سەر تەواوی شانۆکە دەجوولێت، ئەم کامێرایە لە سەرەتای هەواڵەکان، و دوای ناوبڕ و ڕێکلامەکان، و ڕاگواستن لە هەواڵە نێوخۆییەکان بۆ نێودەوڵەتییەکان، یان کۆتایی هاتنی هەواڵە سیاسییەکان و چوونە سەر باسی هەواڵە ئابوورییەکان، بەکاردێت.

هەندێك کەناڵ لە لایەکی ئەو بەشە شوێنێك بۆ چاوەڕوانی میوانان، و شوێنێك بۆ ماکیاژ تەرخان دەکەن.

**٤/ شانۆ (پلاتیۆ):** پلاتیۆ (Plateau)، ئەو شوێنەیە بێژەری تێدا دەردەکەوێت، واجیهەی بڵاوکراوە هەواڵییەکەیە، لە لایەن کەسێکەوە ئیدارە دەکرێت بە ناوی (بەڕێوەبەری پلاتیۆ)، روناکی و میوانەکان ئاڕاستە دەکات، کۆنترۆڵی حاڵەتە نەخوازراو و لە ناکاوەکانیش دەکات.

دیکۆریش بەشێکە لە پرۆسەی پەخش کردن، لە بەشی داهاتوودا تیشکی دەخەینە سەر.

دوای هەموو ئەوانە دەکرێ بڵێین"

دەنگوباسەکان ئامانجی سەرەکی تیمی کارکردنن، ڕادەی سەرکەوتنی کارەکە نیشان دەدەن، بڵاوکراوەکانی تەلەڤزیۆن پێویستیان بە ستافێکی گەورە هەیە، بێژەریش واجیهەی هەواڵەکان و ماندوبوونی تیمی ئامادەکارە

# بەشی نۆیەم

## سکریپت و دەرهێنان لە رادیۆ و تەلەڤزیۆندا

بەشەکانی سکریپت

دەرهێنان

دەرکەوتنی میدیاکار لە بابەتەکەیدا

وێنەگرتن

روناکی

شوێنی کامێرا

جولاندنی کامێرا

باکگراوند

دەنگ

مۆنتاژ

سینۆگرافیا

سکریپت (Script) ئەو نەخشە ڕێگەیەیە لە شێوەی لیستێك ئامادە دەکرێت، هەنگاوەکانی بەرهەم هێنانی کارێکی تەلەڤزیۆنی یان ئێستگەیی دەردەخات، هەر لە ڕێکخستنی دەنگ و وێنەوە تا دەگاتە کاتەکانی قسەکردنی بێژەر و ناوبڕەکانی نێو کارەکە.

## بەشەکانی سکریپت

سکریپت زیاتر لە کاری تیڤیدا بەکار دێت، نووسەری هەواڵ، یان بەڕێوەبەری نووسین بە پشتبەستن بە تەکنیکی مۆنتاژ و مێکساژ ئامادەی دەکات ([1]). سکریپیت دوو لایەنی هەیە، تەکنیکی و نووسین، تەکنیکییەکە پەیوەندی بە دەنگ و رەنگەوە هەیە، نووسینیش بە دەقەکەی بێژەر و هێماکانەوە.

لەم گۆشە نیگایەوە دەکرێ سکریپت بە سەر دوو بەشی سەرەکی دابەش بکەین:

**١/ سکریپتی تێکستی بێژەر: ئەو تێکستە لەخۆ دەگرێت کە بێژەر دەیخوێنێتەوە، لەگەڵ چەند هێما و نیشانەیەك، ئەو نووسینانە بۆ بێژەر و دەرهێنەر و تەکنیککاران روون دەکاتەوە کە لە کاتی پێشکەش کردنی هەواڵەکان لەسەر سکرین دەردەکەون.**

- ***هێما و نیشانەکان لە کەناڵێکەوە بۆ یەکێکی دیکە جیاوازە***

**– p.v (1)ئەمڕۆ سەرۆکی حکومەت (ناوەکەی)بە سەردانێکی دوو رۆژە بەرەو ئەنکەرا بەڕێکەوت/a.d (2) سەردانەکەی سەرۆکی حکومەت بۆ تاوتوێکردنی پرسە هاوبەشەکانی هەردوو لاو و بارودۆخی ناوچەکەیە/ ناوبراو بەر لە سەفەرەکەی، لە دیوانی سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیران سەرۆکایەتی کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی وەزیرانی کرد (٣)تیایدا داوای یەکلاکردنەوەی خێرای دۆسیەی......**

١.p.v: دەرکەوتنی بێژەر لەسەر شاشە

٢.a.d: وێنەی سەرەك حکومەت لە پشت بێژەرەوە دەردەچێت

٣.دەرکەوتنی *ڤیدیۆی هەواڵەکە لەسەر شاشە......*

---

(١) زۆربەی تەلەڤزیۆنە کوردییەکان بێ سکریپت کارەکانیان رایی دەکەن، بەڕێوەبەری نووسین بە پشت بەستن بە وێنە و ناوەڕۆکی بابەتەکان، تێکستێك ئامادە دەکات، هێڵە گشتییەکانی ئامادەکردنی بەرنامەکە یان بڵاوکراوە هەواڵیەکە رێك دەخات، لە رووی پراکتیکییەوە ئەو شێوازە خێرا و ئاسانترە، بەڵام کارێکی پیشەگەرانە بەرهەم ناهێنێ.

***هەر کەناڵێك هێما و نیشانەی تایبەت بەخۆی هەیە، ئەوەی ئێمە لەو سامپڵەی سەرەوە خستمانە روو تەنها نمونەیە نەك رێسا، کەناڵەکان بە گشتی پیتی ئینگلیزی بۆ هێماکان دادەنێن.***

**٢/** سکریپتی بابەت: **لە سێ ستوون پێك دێت، ئەوانیش“**

- ستوونی کات: ژمێرەرێکە یارمەتی رۆژنامەنووس دەدات تا بزانێ هەر بڕگەیەك دەبێ چەند خولەك یان چرکە بێ، کاتی بڵاوکراوەکە چەندی رۆیشتووە و چەندی ماوە، هەروەها یارمەتی دەدات بۆ کۆتایی هێنان بە بڕگەیەك ئەگەر کاتی خۆی تێپەڕاند، بەتایبەت لەو حاڵەتانەی بڕگە هەواڵییەکە میوانداری یەکێك بکات، هاوکات کاری مۆنتاژ و دەرهێنان و پەخشیش ئاسانتر دەکات، چونکە تەکنیککاران بەهۆیەوە دەزانن چ کاتێك وێنەکان دادەنێن، و چ کات دەنگی تەعلیق دەردەچێ و ...تاد. بە گشتیش کەناڵەکان کاژێرەکە یان ژمێرەرەکە لە لای چەپی سکرینی ئەو کامێرایە دادەنێن کە بەرامبەر بێژەرە، لە ٍسکریپیتی گشتیش هێمای (T) کە واتای کات، تایم دەگەیەنێ، یان (TC) کە مانای کۆدی کاتە، بۆ دادەندرێت.

- ستوونی دەنگ: هێماکەی (A) ئەیدیۆ یە، شریتێکە هەموو ئەو دەنگانە کۆدەکاتەوە کە لە بڵاوکراوەکە یان بەرنامەکان دەردەچن، وەك“ مۆسیقا، کۆمێنت (نەك بە مانای رادەربڕین دەربارەی هەواڵەکە بەڵکە خوێندنەوە و روونکردنەوەی)، دەنگی بەشدارابووان، دەنگی درەوە (رەشەبا، ژاوەژاوی ئۆتۆمبیل، شەپۆڵی دەریا...تاد.).ئەم ستوونەش هاریکاری کرداری دەرهێنان دەکات.

- ستوونی وێنە: هەموو ئەو وێنانە رێك دەخات کە لە بابەتەکە دەردەکەون، وەك“ فۆتۆی شوێنی رووداو، وێنەی ئەوانەی لێدوان و رایان وەردەگیرێت، وێنەکانی کۆمپیوتەر (گرافیك)، وێنە روونکەرەوەکان، وێنەی ئەو خانە یان چوارچێوەیەی بۆ هەندێك بابەت بەکار دێت بۆ زانیاری بەخشین دەربارەی ژیانی کەسێك، یان وردەکارییەکانی بابەت و پرسێك.

## دەرهێنان

وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، کارکردن لە رۆژنامەگەری خوێندراو لەگەڵ بیسترا و بینراو لە رووی ناوەڕۆك و جێبەجێ کردنەوە جیاوازی هەیە، ئەگەر ئەو جیاوازییە لە رووی ناوەڕۆکەوە کەم بێت، ئەوا لە رووی جێبەجێ کردن و لایەنی تەکنیکییەوە زۆرە.

لە رۆژنامەگەری نووسراودا رۆژنامەنووس تەنها پێویستی بە نووسینی بابەت و ئامادەکردنی چەند وێنە و چوارچێوە و مانشێتێك هەیە، بەڵام لە میدیای بینراودا پێویستە لە کاتی ئامادەکردنی بابەتەکە رەچاوی" کات، شێوەی نووسین، لایەنی تەکنیکی، گرتنی وێنەی گوزارشتکەر لە ناوەڕۆکی بابەتەکە بکرێت.

گەر قسەکانمان وردتر بکەینەوە، دەتوانین بڵێین" ئەگەر رۆژنامەنووس لە رۆژنامەگەری نووسراودا پێویستی بە تۆمارکردنی رووداوەکان و دواتر داڕشتنەوەیان بێ، ئەوا لە تیڤیدا هەر ئەو رۆژنامەنووسە دەبێ هاوشان لەگەڵ کامێرامان و تەکنیککاران، خەمی دابین کردنی گرتەی پێویست و وێنە و شێوازی بڕین و خستنە سەریەکی قسەی کەسانی بەشداربووی بابەتەکەی بێ.

ئەم بەرپرسیاریەتییەی رۆژنامەنووس تەنها بە ئامادەکردنی بابەتە هەواڵییەکان بەند نییە، بەڵکە لە کاتی ئامادەکردنی ریپۆرتاژ و چاوپێکەوتنیش، جا دیمانەکە بۆ هەواڵ ساز کرابێ یان بە شێوەیەکی سەربەخۆ.

گرتە لکێنەرەکان رۆڵێکی سەرنج راکێش لە خستنە رووی بابەتەکانی تیڤی و تەشویقی وەرگر دەبینن، ئەو وێنە و گرتانە قسەکانی رۆژنامەنووس بە وتەی قسەکەر دەبەستنەوە، دوو جۆری سەرەکین، یەکێکیان پەیوەندی بە کاتی ئەنجامدانی چاوپێکەوتن یا ریپۆرتاژەکە هەیە، وەك (وێنە گرتنی جووڵەی دەستی قسەکەر، سەر لەقاندنی رۆژنامەنووس بۆ میوانەکەی لە کاتی قسەکردندا، دیمەنێك لە نووسینگەکەی، گرتەیەك لە دیمەنی گوێگران لە قسەکانی یان وتارەکەی...تاد)، ئەم جۆرە بە (Ctu in) ناو دەربرێت.

جۆری دووەمیان (Cut away) پێ دەگووترێت، لە رووی جێبەجێ کردنەوە پەیوەندی بە ساتەوەختی ئەنجامدانی بابەتەکە نییە، پێش چاوپێکەوتنەکە یان دوای کۆتایی هاتنی وەردەگیرێت، وەك (ساتی پێشوازی کردنی میوانەکە لە رۆژنامەنووس، کاتی کۆتایی هاتن و خواحافیزی کردن، دیمەنی ئەو گفتۆگۆیەی بەر لە تۆمارکردن لە نێوان هەردووکیان روودەدا...تاد). (١)

پێشەکی چاوپێکەوتنەکان لە رادیۆ و تیڤی دەبێ زۆر کورت بێ، خاڵی بێ لە هەر گوتە و ئاماژەیەکی مەدح کردن و پێهەڵدان، دەکرێ ناساندنی بابەتییانەی میوانەکە بکرێتە پێشەکی، یان پێشەکی لە رێگەی پرسیارەوە بخرێتە روو ئینجا ناوی میوانەکە و پلەکەی ئاشکرا بکرێت، ئەم جۆرە پرسیارە بە پێشەکییە پرسیار ناو دەبرێت.

لە رادیۆدا دەبێ زوو زوو ناوی میوانەکە دووبارە بکرێتەوە، تا بیستەرە نوێیەکان، ئەوانەی لە سەرەتای دیدارەکەوە گوێبستی رادیۆکە نەبوونە،،بە ناو و وەزیفەکەی ئاشنا بن.

لە کۆتایی چاوپێکەوتنەکەش هەوڵ بدە لە شوێنێکی گونجاو قسەکانی میوانەکە ببڕی و سوپاسی بکەیت، بێ چاوەڕێکردنی سوپاس و پێزانینی میوانەکە، و تۆمارکردنی ئەو جۆرە قسانە.

- ***پێشەکی چاوپێکەوتنی تەلەڤزیۆنی جەخت لەسەر گرنگی میوانەکە و بابەتەکە دەکات:***

*- (فلانی کوڕی فلان) تۆ پسپۆری شێوێنەوارناسیت/ نووسین و کتێبەکانت گوزارشت لە بایەخدانت بەو بوارە دەکەن/ پێشتر بەڕێوەبەری گشتی شوێنەوار بوویت، ئێستاش راوێژکاری سەرۆکی حکومەت بۆ کاروباری شوێنەوار و گەشت و گوزار.......*

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ئەحمەد زەینەدین، ١٦٠- ١٦١ .

*- پرسیاری دەستپێك، ئامانجی سازدانی چاوپێكەوتنەكە ئاشكرا دەكات: وەك دەزانن بابەتی دزینی چەند پارچە شوێنەوارێك لە مۆزەخانەی نیشتمانی هەرایەكی گەورەی نایەوە، و بووە جێ بایەخی رای گشتی، تا ئێستا هەندێك وردەكاری ئەم بابەتە ناروون و بزرە، دەمەوێ یەكەم پرسارم بەوە دەست پێبكەم......*

وێنەكانی كۆمپیوتەر، یان گرافیك، توخمێكی گرنگی بابەتەكانی تیڤین، شان بەشانی گرتە زیندووەكان، بەكارهێنانیان پێویستە، هەنوكە زۆربەی تەلەڤزیۆنەكان بەشی تایبەت بە گرافیكیان هەیە، رۆژنامەنووسان و بەشی دەرهێنان بە پێی جۆری بابەتەكان، داوای ئامادەكردنی وێنەیان لێدەكەن.

دانانی زانیاری و داتا لە گەڵ بابەتەكان، هەمدیس خزمەتی بابەتەكانی تیڤی دەكات، مەعریفەی خوێنەر زیاد دەكەن، بەڵام دەبێ ئاگاداری كاتی دانانیان بین، نابێ هاوكات لەگەڵ پەخش كردنی دەنگ و وێنە و كۆمێنتەكان دابندرێن، پێویستە دوای هەموو ئەوانە، لە كۆتاییدا بخرێنە روو.

پێویستە گرنگی دەنگ و مۆسیقاشمان لە بیر نەچێ، بە تایبەت لە گەڵ ریپۆرتاژ و بەدواداچوونەكان، دەبێ دەنگەكان گوزارشت لە ماهیەتی ناوەرۆك بكەن، ئەو دەنگانە زۆر جۆری هەیە، لەوانە" (دەنگی بۆردومان كردن، دەنگی شەپۆلی دەریا، دەنگی گریان، پێكەنین، هاوار، ژاوەژاو، دەنگی ئاسایی....تاد)،پێویستە مۆسیقاكەش گونجاو بێ، بە تایبەت ئەوانەی لە سەرەتا و كۆتاییدا دادەندرێن.

واباشە بەر لە دەست كردن بە تۆمار كردن، رۆژنامەنووس گفتوگۆیەك دەربارەی بابەتەكە لەگەڵ میوانەكی بكات، تێی بگەیەنێ بە دیاریكراوی چ لایەنێكی بابەتەكەی گەرەكە و پێویستە وەڵامەكانی تەركیز لەسەر چی بكات.

## دەرکەوتنی میدیاکار لە بابەتەکەیدا

دەرکەوتنی وێنە و گرتەی زیاد و نا پێویست لە بابەتە تەلەڤزیۆنییەکان، کاریگەری خراپە، هیچ ئیزافەیەك ناخاتە سەر بابەتەکە، لەو گۆشە نیگایەوە، دەرکەوتنی میدیاکار لە بابەتەکەیدا بە بێ هیچ هۆ و بۆنەیەك، کارێکی نەخوازراو و نا پەسندە، ناکرێ رۆژنامەنووس لە هەر راپۆرت و بەدواداچوون و ریپۆرتاژ و رووماڵێك کە ئامادەی دەکات، وێنەی خۆی دابەزێنێ.

## لە هەندێك حاڵەتی زەروورردا دەکرێ میدیاکار دەربکەوێت، ئەو حاڵەتانەش بریتین لە:

- خستنە رووی ئەو زانیاریانەی وێنەیان نییە، یان رووماڵ کردنی کۆبوونەوەیەکی نهێنی کە ناکرێ وێنەی بگیرێت.

- ئەگەر بابەتەکە زۆر دوور و درێژ بوو، لەو حاڵەتەدا دەشێ میدیکار بۆ بەستنەوەی وێستگە سەرەکییەکانی، لە سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی دەر بکەوێ. لە دەستپێکدا بە کورتی بیرۆکەی بابەتەکە بخاتە روو، لە ناوەڕاستیش تەوەرە سەرەکییەکان، لە دوا بەشیشدا کۆتایی بە بابەتەکە بێنێ و دایبخات. لە هەموو حاڵەتەکانیشدا دەبێ میدیاکار دەرکەوتنەکەی لە حاڵەتی جووڵەدا بێ، وەستاو و جامد نەبێ.

تێستا لە تیڤیدا واباوە لە کۆتایی هەموو بابەتێك رۆژنامەنووسەکە دەربکەوێ، لەو دەرکەوتنە کۆتاییەدا، بابەتەکەی دادەخات، لە گەل ئاماژەدان بە ناوی خۆی و کەناڵەکەی و شوێنی ئامادەکردنی.

لە کاتی دەرکەوتندا، پێویستە رۆژنامەنووس بزانێ چی دەڵێ، چۆن دوماهی بە قسەکانی دێنێ بە شێوەیەك پیشەگەرانە بێ و بۆنی هیچ رادەربڕین و بۆچوونێکی شەخسی لێنەیەت.

واباشە بەر لە قسەکردن بە خێرایی لە دڵی خۆیدا چەند پەڤێك لەبەر بکات، لە کاتی دەربڕینیدا روون و رەوان بێ، سیاغەی زمانەوانی دروست بێ.

له نێو ستۆدیۆدا، ئەگەر بابەتەکە درێژ بوو، دەتوانێ پەنا بۆ ئامێری خستنە رووی نووسین ببات، یان نووسینەکە لە تەنیشت کامێراکە هەڵواسێ، واباشە ئادگاری دەموچاوی لەکاتی خوێندنەوەدا بگۆڕێ و بجولێنێ، هەندێك جاریش بە دەست ئاماژە بکات.

## وێنەگرتن

وێنەگرتن وەزیفەی رۆژنامەنووس نییە، بەڵام پێویستە زانیاری و شارەزایی لە بارەیەوە هەبێ، هەنوکە ئاراستەیەکی وا بەرێوەیە رۆژنامەنووس و کامێرامان هەردووکیان لە یەك کارەکتەر کۆبکرێنەوە، واتە رۆژنامەنووس لە پاڵ کارەکەی خۆی کامێرامانیش بێ، ئەگەر چی ئەوە لە رووی پراکتیکییەوە کەمێك زەحمەتە، بەڵام مانای ئەوە نییە راهێنان و زانیاری دەربارەی وێنەگرتن نەبێ، لەبەر دوو هۆکاری سەرەکی" یەکەمیان: بەهۆی هەر هۆکارێکەوە بێ لەوانەیە هەندێك کات رۆژنامەنووس ناچار بێ بە کاری کامێرامان هەڵسێ، و وێنەی بابەتەکەی بگرێ. دووەمیان: هەندێك کات لەوانەیە کامێرامان وەك پێویست بە کارەکەی هەڵنەستێ، یان وەك ئەوەی رۆژنامەنووسەکە دەیەوێت، وێنەی بابەتەکە نەگرێ، لێرەدا میدیاکار بەهۆی شارەزایی خۆی دەتوانێ ئاراستەی کامێرامانەکە بکا و رێنمایی پێویستی بداتێ.

هەواڵەکان و بابەتەکان پێویستە بە یەك جۆرە کامێرا وێنەیان بگیرێ، واتە لە کاتی ئامادەکردنی ریپۆرتاژێك دەبێ تەواوی ریپۆرتاژەکە بە یەك جۆرە کامێرای قەبارە و کوالێتی یەکسان بگیرێت، هەتا ئەگەر هاتوو بەشێکی ریپۆرتاژەکە لە دەرەوەی وڵات، بەهۆی نووسینگەیەکی کەناڵەکەوە ئامادە بکرێت.

## روناکی

رەچاو کردنی روناکی لە کاتی وێنەگرتن و پەخشدا چ لە نێو ستۆدیۆ بێ یان دەرەوە کارێکی زەرووره، هەموو کەناڵێك پێویستی بە کارمەندی روناکی هەیە، رێکخستنی روناکی زانستە، هەندێك زانکۆ بەشی تایبەت بە روناکی هەیە، دەرچوانی ئەو بەشە بە ئەندازیاری روناکی ناودەبرێن

**تەلەڤزیۆنە کوردییەکان پێویستی زیاتریان بە ڕێکخستنی روناکی لە نێو ستۆدیۆکان، و کارمەندی پرۆفێشنالّی ئەو لایەنە هەیە.**

## شوێنی کامێرا

**شوێنی کامێرا جێگەی دانانی کامێراکانە، جا لە ناوەڕاست دابێ یان لە تەنیشت و گۆشەکان، لە رووی بەرزی و نزمیشەوە دوو ئاستی هەیە، یەکێکیان لە ئاستێکی بەرزتر لە دیمەنەکە یان کەسەکە، وێنە دەگرێت، ئەوی دیکەیان لە ئاستێکی نزمتر، لەو بارەدا پێگەکەی دەکەوێتە خوار کەسی وێنە گیراو. ئەم شێوازە زیاتر بۆ وێنەگرتنی مەشهەدە جێگیرەکان و کەسەکان لە کاتی دانیشتندا، بەکار دێت.**

## جوڵاندنی کامێرا

کامێرا لەسەر ستاندە سێگۆشەییەکان دادەندرێت، ئەگەر بۆ گرتەیەکی کورتیش بەکار هات، هەر دەبێ لە ستاند چەسپ بکرێت، چونکە هەر لەرزین و جوڵەیەك گرتەکە ناشیرین و لەرزۆك دەکات.

نابێ کامێرا جووڵەی پێ بکرێت، دەکرێ بەهۆی زوومەوە هەموو دیمەن و کەسەکان نزیك بکرێنەوە، تەنها حاڵەتی جوڵاندنی کامێرا جوڵاندنیەتی بە ئاڕاستەی تەنیشتەکان، بەرە و باکوور یان بەشوور، هەروەها بەرزکردنەوە و دابەزاندنیش، بێگومان ئەو کردارەش هەر لەسەر ستاند ئەنجام دەدرێت.

لە وێنەگرتنی میدیایدا بە پێچەوانەی کارە درامییەکان زۆر بە کەمی کامێرا بەرەو تەنیشتەکان دەجوڵێت، هەروەها زووم کردنیش کەمتر بەکار دێت، وێنەکان بە ئاسایی دەگیرێن، وێنەیەکی دوور وێنەیەکی نزیك، دواتر بەهۆی مۆنتاژەوە لێك دەدرێن.

دوای وێنەگرتنی هەر مەشهەدێك، واباشە چەند چرکەیەك کامێراکە بوەستێندرێ، ئینجا وێنەی دیمەنێکی دیکە وەربگیرێت، ئەم کارە پرۆسەی مۆنتاژ ئاسان دەکات، تەکنیککار ئاسانتر دەتوانێ دیمەنەکان بە یەکتری ببەستێتەوە.

## باكگراوند

لە کاتی پێشکەش کردنی هەواڵەکان، پێویستە بە وردی ڕەچاوی ئەوە بکرێت چی لە پشت بێژەرەکەوە دەربچێ، ئەوەی دەردەکەوێ ڕەنگ و کوالێتی چۆنە، هەموو ئەمانە دەبێ حسابیان بۆ بکرێ.

بۆ چاوپێکەوتنەکانیش، پێویستە وێنەیەك دابندرێ گوزراشت لە پسپۆڕیەتی و کاری میوانەکە بکات، بۆ نموونە (ئەگەر چاوپێکەوتنەکە لەگەڵ نووسەرێك یان ڕۆشنبیرێك بوو دەبێ باکگراوند کتێبخانە یان کۆمەڵە کتێبێك بێ، ئەگەر کرێکار بوو دەبێ وێنەی دروست کردنی باڵاخانە و خانوو دابندرێت...تاد).

## دەنگ

دوای نووسینی تێکست لە لایەن ڕۆژنامەنووسەوە، ئینجا نۆرەی خوێندنەوەی دێت، واباشە نووسەری تێکستەکە بە دەنگی خۆی لە ژوورێکی تایبەت بیخوێنێتەوە، دەشکرێ ئەم کردارە هاوتا لەگەڵ پرۆسەی مۆنتاژ ئەنجام بدرێ، یان تۆمار بکرێ و دواتر لەگەڵ وێنەکان دابندرێ.

هەر سەبارەت بە دەنگ، دەبێ میدیاکار بزانێ دوو جۆرە مایکرۆفۆن هەیە، یەکێکیان لە کاتی چاوپێکەوتندا تەنها دەنگی ئەو کەسە تۆمار دەکات کە لە بەر دەمی ڕاگیراوە، ئەوی دیکەیان دەنگی قسەکەر و دەوروبەرەکەشی دەگوازێتەوە، بە پێی جۆری بابەتەکە میدیاکار هەر یەکەیان بەکار دێنێ، بۆ نموونە گەر چاوپێکەوتنەکە دەربارەی قوتابخانەکان بوو، قسەکەریش مامۆستا بوو لە گۆڕەپانی قوتابخانەیەك قسەی دەکرد، باشترە دووەم جۆری مایکرۆفۆن بەکار بێت تا دەنگی قوتابییەکانیش لە چاوپێکەوتنەکە دەربچێ (ئەمە بۆ ڕادیۆکان زۆر پێویستە).

## مۆنتاژ

مۆنتاژ دوا پرۆسەی کاری تەلەڤزیۆنییە، دوای ئەمە بابەتەکە ئامادەیە بۆ بڵاوکردنەوە.

مۆنتاژ دوو جۆری سەرەکی هەیە، یەکێکیان بە ستوونی ناو دەبرێت، بریتییە لە تۆمارکردنی سەرجەم دەنگ و وێنەکان لەسەر شریتی کەهرۆموگناتیسی، ئینجا

زیاد کردنی دەنگ بۆی لە نێویشیاندا خوێندنەوەی بابەتەکە بە دەنگی ڕۆژنامەنووس.

دووەمیشیان مۆنتاژی دیژیتەڵییە، بریتییە لە تۆمارکردنی تەواوی دەنگ و ڕەنگەکان لە سەر سێدیەك، دواتر ئیزافەکردنی دەنگی دیکە و لکاندنی بە شوێنی پێویست.

لە ئێستادا جۆری یەکەم بەرەو لەناوچوون دەچێت، زۆر بەدەگمەن کەناڵەکان پەنای بۆ دەبەن.

## سینۆگرافیا (دیکۆر)

سینۆگرافیا لە تیڤی بریتییە لە دیکۆری مێز و چوارچێوە و باکگراوندی سکرینی ستۆدیۆکان، هەروەها شێوازی جوڵە پێکردنی کامێرا و جوڵەی کارمەندان لە نێو ستۆدیۆ.

هەندێك لۆگۆی کەناڵەکە و شوێنی دانانی لەسەر شاشەش بە دیکۆر دادەنێن، بەگشتی دیکۆری میدیای بینراو و بیستراو دوو جۆرە، یەکێکیان پەیوەندی بە شکلیاتەوە هەیە، ئەو شتانەی ماددی و دیارن، وەك لە سەرەوە ئاماژەمان پێدا، دووەمیشیان پەیوەندی بە لایەنی مۆنتاژ و شێوازی کۆتایی هێنان بە بابەتێك و چوونە نێو بڕگەیەکی دیکەوە هەیە.

چەند ناوەڕۆکی بابەتە ئیعلامیکە بۆ کارکردنە سەر وەرگر گرنگە، سینۆگرافیاش ئەوەندە گرنگە، پەیڤ و ڕستەی پڕ مانای گۆشتکرا و بە دەنگ و ڕەنگ، گەر بە دیکۆر و کوالێتییەکی باش نەگەیەندرێتە وەرگر، بێگومان کاریگەریەکەی نیوە چڵ دەبێ، و درەنگتر ئامانجەکەی دەپێکێ، ئەمە وێڕای ئەوەی کاریگەری لەسەر ڕاکێشانی سەرنجی وەرگر، و ڕاکێشانی هەواداری زیاتر بۆ کەناڵەکە هەیە.

## لە کۆتایی ئەو بەشەدا دەڵێین:

تایبەتمەندی کاری ڕادیۆ و تیڤی لە پرۆسەی جێبەجێکردندا بەرجەستە دەبێ، میدیاکار جگە لە نووسین و گەڕان بەدوای هەواڵدا، دەبێ زانیاری سەرەتایی دەربارەی مۆنتاژ و وێنەگرتن هەبێ، سکریپت و سینۆگرافیا کورترین ڕێگەی بەرهەم هێنانی تیڤی و ڕادیۆیین، کات و ماندوبوونی کارمەندان کەمتر دەکەنەوە.

# بەشی دەیەم

## میدیای ئەلیکترۆنی

سروشتی میدیای ئەلیکترۆنی

تەکنیکی میدیای ئەلیکترۆنی

جۆرەکانی میدیای ئەلیکترۆنی

میدیای ئەلیکترۆنی، جۆری چوارەمی میدیایە، دوای میدیای خوێندراو و بیستراو و بینراو، ئینجا میدیای ئەلیکترۆنی سەریهەڵدا، تەکنەلۆژیا رۆڵی گرنگی لەسەر لە دایك بوونی جۆرەکانی رۆژنامەگەری هەبووە، هەر بازدان و پێشکەوتنێکی تەکنەلۆژیای پەیوەندی کردن و گەیاندن، هەوێنی لەدایك بوونی جۆرێکی میدیا بووە.

میدیای ئەلیکترۆنی کوڕی تەکنەلۆژیای دیژیتاڵییە، یەك لە دەرهاوێشتەکانی جیهانگەرایی و سەدەی تەکنەلۆژیایە.

ئەگەرچی ئیشکالیەت و گرفتەکانی ئەو میدیایە زۆرن، و هێشتا لە سەرەتا دایە و ماویەتی تەواو کامڵ بێت، بەڵام لە ئەرزی واقیعدا حزورێکی دیاری هەیە و رکابەری تەلەڤزیۆن دەکات، لەو بەشەدا بە کورتی رۆشنایی دەخەینە سەر تەکنیکی نووسین لە میدیای ئەلیکترۆنی و هەندێك لایەنی دیکەی پەیوەندار .

## سروشتی میدیای ئەلیکترۆنی

میدیای ئەلیکترۆنی یەك لە سیماکانی سەدەی ئێستامانە کە بە سەدەی دیژیتاڵی ناو دەبرێت، تەکنەلۆژیای زانیاری و دیژیتاڵی، جێپەنجەیەکی دیاری بە سەر تەواوی کایەکانی ژیانەوە هەیە، گۆڕانکاری بنەڕتی لە سەر زۆرێك لە تێگەیشتن و چەمکەکانی رابردوو دروست کردووە، هاوکات شێوەی ژیان و بیرکردنەوەی مرۆڤیشی گۆڕیوە.

لێکەوتەکانی ئەم پێشکەوتنە زۆر بە روونی بەسەر بواری میدیاوە دەبیندرێت، کاریگەرییەکانی لە دوو شێوەدا خۆی بەرجەستە دەکات" یەکەمیان: ئەو گۆڕانکارییانەی لە رووی میکانیزمی کارکردن، و شێوازی بەرهەم هێنان و جێبەجێ کردنەوە بە سەر هۆکانی راگەیاندندا هاتووە، دووەمیان: لە دایك بوونی چەند کەرەستەیەکی نوێی میدیاییە کە دەچنە خانەی ئەوەی بە (Multimedia) ناو دەبرێت.

میدیای ئەلیکترۆنی و سۆشیال میدیا بەشێکن یان کەرەستەیەکن لە کەرەستەکانی مەڵتی میدیا، میدیای ئەلیکترۆنی لە سادەترین پێناسەیدا میدیایەکی هەمەجۆر و تێکەڵە لە رۆژنامەگەری بینراو و بیستراو و خوێنراو، خاسیەتەکانی هەریەکەیانی لەخۆیدا کۆکردۆتەوە، لە رۆژنامەگەری خوێندراودا تێکستی وەرگرتووە، لە رادیۆش دەنگ، و لە تیڤیش وێنە.

تۆڕی تۆڕەکان، ئینتەرنێت بڕبڕەی پشتی رۆژنامەگەری ئەلیکترۆنییە، بەهۆی ئەو تۆڕەوە لە چەند چرکەیەکدا، تێکستە میدیاییەکان هاوشێوەی دەنگە رادیۆیی و وێنە تەلەڤزیۆنییەکان دەگەنە ئەوسەری دونیا، بە پێچەوانەشەوە. ئاسۆی ئەم شێوە میدیایە فراوان و نا سنووردارە، بە هۆی تەکنەلۆژیای زانیاری و پێشڤەچوونی خێرای تەکنەلۆژیا، بەردەوام لە نوێ بوونەوە فراوان بوون دایە.

## تەکنیکی میدیای ئەلیکترۆنی

تەکنیکی ئەو شێوە رۆژنامەگەرییە تەکنیکێکی تێکەڵە و هەمەجۆرە، لە توخمە سەرەکییەکانی تەکنیکی رۆژنامە و رادیۆ و تیڤی پێك دێت، چونکە خۆی لە بنەڕەتدا پێکهاتەیەکە لە کۆمەڵێك تێکست و دەنگ و وێنەی جێگیر و زیندوو، لە سەر هەمان ئەو یاساو رێسایانە بەرهەم دەهێندرێت کە لە بەشەکانی ئەم کتێبە ئاماژەمان پێدا،

بێگومان ئەمەش بەو مانایە نایەت هیچ خسوسیەت و خەسڵەتێکی نییە، و دەقا و دەق هەمان تەکنیکی جۆرەکانی دیکەی میدیا بەکار دەهێنێت.

لە رووی زەمەنەوە، هاوشێوەی تیڤی هیچ سنوورێك بۆ تێکست و بابەتەکانی نییە، بابەتەکان چ وەك جۆر چ وەك ناوەڕۆك، چ وەك نوێی و تازەیی، بەردەوام لە تازەبوونەو ە و فراوانبوون دان.لە رووی قەبارە و پانتایشەوە، نووسینەکان هاوشێوەی تێکستی بڵاوکراوەکان بیٚ سنوور دوور و درێژن.

هەواڵی سادە لە رۆژنامەگەری ئەلیکترۆنی  وەك رووی دەرەکی ئەو چیا بەفرییە بەستووەیە کە لەنێو خۆیدا دونایەك ئاوی حەشارداوە، هەواڵی سادەش بە هەمان شێوە، تەنها رووی دەرەکی کۆمەڵێك هەواڵ و زانیاری دیکەیە، لەو هەواڵەدا، ناوی هەر کەس و شوێن و هەواڵێکی دیکە، بە لینکێکی دیکە دەبەسترێتەوە، ئەویش لە تێکستێکدا کۆمەڵێك زانیاری دیکە دەبەخشێت، لەوانەیە ئەمەشیان چەند لینکێکی دیکە لەخۆ بگرێت.

تەکنیکی نووسینی میدیای ئەلیکترۆنی پێویستی بە زانیاری دەربارەی سەرجەم جۆرەکانی دیکەی نووسینی رۆژنامەگەری هەیە، پێویست رۆژنامەنووس زانیاری دەربارەی مانشێت وجۆرەکانی و چۆنیەتی نووسینی پێشەکی و کۆتایی هەبیٚ، هاوکات لێزانیش بیٚ لە چۆنیەتی ئیدارەکردنی پێگە ئەلیکترۆنییەکان و شێوازی داخڵ کردن و نویٚ کردنەوەی بەردەوامی داتا و زانیارییەکان.

یەك لە خاسیەتە دیارەکانی میدیای ئەلیکترۆنی، کە بە روونی لە جۆرەکانی دیکەی جیا دەکاتەوە، پابەندنەبوونیەتی بە خولێکی دیاریکراوی کارکردن، وەك ئەو خولە کارەی بڵاوکراوە و رادیۆ و تیڤییەکان لە ماوەی ٢٤ کاژێردا هەیانە، خولی کار لێرەدا بەردەوام و کراوەیە، بابەتەکانی، تازەیی رادیۆ و تیڤی، و قووڵیی و تەواوکاری گۆڤارەکان لەخۆیدا کۆ دەکاتەوە.

لە میدیای دیژیتاڵی هیچ فەزا و مانایەك بۆ خولی کار و تەوقیت نییە، گۆڤار و هەفتەنامەکان لە رێگەی سایتەکانیانەوە رکابەری و پێشکبڕکیٚ لەگەڵ رۆژنامە و تەلەڤزیۆنەکان دەکەن، رۆژنامەش بەهۆی پێگەی ئەلیکترۆنییەوە دەتوانیٚ هاو زەمەن لەگەڵ تەلەڤزیۆن، وێنەی زیندوو (ڤیدیۆیی) پەخش بکات، ئاژانسە

هەواڵییەکانیش چیتر پێویستیان بە چاوەڕێ کردنی ٢٤ کاژێر نییە تا بزانن لەو ماوەیە چی روویداوە.[(١)]

## جۆرەکانی میدیای ئەلیکترۆنی

بە گشتی دەتوانین دوو جۆری سەرەکی رۆژنامەگەری دیژیتاڵی دیار بکەین:

**یەکەم:** ئەو سایتە ئەلیکترۆنیانەی دەزگا رۆژنامەوانییەکان، بینرا و بیستراو و خوێنراو دایدەمەزرێنن، و بەشێکن لە رۆژنامەکان یان رادیۆکان یان تەلەڤزیۆنەکان، لەم حاڵەتەدا پێگە ئەلیکترۆنییەکە، دەبێتە تەواوکاری کەناڵەکە و زانیاری زیاتر و قوڵتر و نوێتر لەوەی لە کەناڵی دایك بڵاوی کردۆتەوە، دەخاتە روو، لەگەڵ دابینکردنی خانە و خزمەتگوزاری پێویست بۆ بەشداریکردنی وەرگر و بەردەوام بوونی لەگەڵ کەناڵەکە، یانیش هەر بەتەواوی رەنگدانەوە و ئینعیکاسی کەناڵی دایکە، تەنها هەواڵ و بابەتەکانی ئەو، ئەلیکترۆنیانە بڵاو دەکاتەوە.

**دووەمیان:** ئەو سایتانەن کە تایبەت بۆ کاری رۆژنامەوانی دادەمەزرێن، هەندێکیان ناوی خۆیان بە رۆژنامە، هەندێکی دیکەیان بە رادیۆ، هەندێکی دیکەشیان بە تیڤی ناو دەبەن، لە گەڵ ئەوەی هەموویان کاری هەرسێ کەرەستە لە یەك کاتدا ئەنجام دەدەن.

هەندێك سایتش وەك (گوگڵ و سایتی دامو دەزگا و زانکۆ و کۆمپانیا و...تاد) لە گەڵ ئەوەی خۆیان وەك سایتی رۆژنامەنووسی ناناسێنن، کەچی هەمان ئیشی راگەیاندن دەکەن بەڵام بە جۆرێکی دیکە، لە رێگەی ئەو بەش و لینکانەی بۆ گەڕان بە دوای زانیاریدا بۆ جەماوەری دەسەبەر دەکەن.

رۆژنامەگەری ئەلیکترۆنی دەروێکی گەورەی بە رووی ئازادی دەربڕین و را دەربڕینی شەخسی کردەوە، سەرباری کەموکورتییەکان، بە شۆڕشێکی گەورەی ئازادی رادەربڕین هەژمار دەکرێت گەر مەسئولانە بەکار بهێندرێت. لە رووداوەکانی ئەم دواییەی ناوچەکە، بە تایبەت رووداوەکانی بەهاری عەرەبی، ئەو جۆرە میدیایە فاکتەری سەرەکی دەرخستنی راستییەکان و سەرکەوتنی شۆڕشەکان بوو، توانی ئەو کەلێنە پڕ بکاتەوە کە بە هۆی سانسۆری رژێمە دیکتاتۆرییەکان لەسەر کەناڵە میدیاییە بیستراو و بینرا و نووسراوەکان دروست ببوو، سۆشیال میدیا رۆڵی بەرچاوی لە گەیاندنی رووداوەکان و تاوانی رژێمە دیکتاتۆرییەکان دەرهەق بە گەلەکانیان بینی.

---

(١) نسيم الخوري، فنون الإعلام و الطاقة الاتصالية، بيروت، دار المنهل اللبناني، ٢٠٠٥، ١٥٣ .

باشییەکی دیکەی میدیای ئەلیکترۆنی، کەمی بڕی تێچوونیەتی، گەر تێچوونی لەگەڵ ئیعلامی تەقلیدی بەراورد بکەین دەبینین جیاوازییەکی زۆری هەیە، سەرباری ئەم کەمی تێچوونەش دەتوانێ وەبەرهێنان لە رێگەیەوە بکرێ، جا ئابووری بێ یان فیکری.

خاڵێکی دیکەی گرنگ ئەوەیە بەکاربەر هەرزان و بێ بەرامبەر سوودی لێ دەبینێ، هەبوونی هێڵێکی ئینتەرنێت بەسە بۆ دەستکەوتنی زۆرترین زانیاری و هەواڵ و رووداو، بە خێرایی و کەمترین تێچوون.

جگە لە پێگە کۆمەڵایەتییەکانی فێیس بوك و تویتەر و...تاد، هەندێك پێگەی دیکەش خزمەتگوزاری کەسی بۆ جەماوەر بەگشتی و خەڵکی نوخبە بە تایبەتی دەسەبەر دەکەن، وەك ئەو لاپەڕە تایبەتانەی هەندێ پێگەی رۆژنامەوانی یان ئەدەبی یان سیاسی یان ئابووری بۆ خەڵکی ئەو بوارانە دابینی دەکەن، تا هەریەکەیان بە پێی پسپۆڕیەتی خۆی، چالاکی و جموجۆڵ و بەرهەم و زانیارییە کەسییەکانی تێدا دابەزێنێ.

سەرباری هەموو ئەوانە، وەنەبێ میدیای ئەلیکترۆنی بێ گرفت و ئاستەنگ بێ، ئاستەنگەکان هەندێکیان پەیوەندیان بە بەکاربەرەوە هەیە، هەندێکی دیکەش بە خودی پێگەکان و رێکخەرانی. لە رووی بەکار بردنەوە، هێشتا لە رۆژهەلات و جیهانی سێیەمدا مەعریفەی زۆرینەی خەڵك بە تەکنەلۆژیاو زانیاری دیژیتاڵی لەو ئاستە نییە هەموو کەسێك بتوانێ بە کاری بێنێت، هەروەها هێڵی ئینتەرنێتیش بەردەوام دەسەبەر نییە، ئەگەر هەشبێت کۆمەڵێك گرفت و کەمو کوری تێدایە.

لە رووی رێکخستنیشەوە، بە هۆی تێکەڵی میدیای ئەلیکترۆنی لەگەڵ جۆرەکانی دیکە، بەرهەم هێنان و ئامادەکردنی هەواڵ و بابەتەکان، و دابین کردنی وێنەی زیندوو، شتێکی ئاسان نییە، بۆیە دەبینین بە بەردەوامی پەنا بۆ وەرگرتن و ئیقتیباس لە رادیۆ و تیڤی و بڵاوکراوەکان دەبات، یان زۆرێك لە بابەتەکان پڕۆفێشناڵانە نانووسرێن، پڕن لە ناتەواوی.(١)

حزوری لەرزۆکی بنەمای میسداقیەت و پرۆفێشناڵیەت لە میدیای ئەلکترۆنیدا، خاڵێکی دیکەی لاوازە کە بە خراپی بەسەریدا شکاوەتەوە، لە سۆشیال میدیادا زۆر

(١) زۆرینەی پێگە ئەلیکترۆنییەکان، نەبوونی یاسای تایبەت بە رێکخستنی رۆژنامەگەری ئەلیکترۆنییان قۆستۆتەوە تا بە ئارەزووی خۆیان و دوور لە ئیتیکی کارەکە زانیاری بڵاوبکەنەوە، هەروەها رەچاوی مافی خاوەندارێتی و بڵاوکردنەوەش نەکەن، بێگومان ئەوە قۆناخێکی کاتییە و تا هەتایە بەردەوام نابێ، رۆژێك دێت لە رێگەی یاساوە رادەیەکی بۆ دابندرێت.

زەحمەتە تەئکید لە راستی یان نا راستی بابەتە بڵاوکراوەکان بکرێتەوە، لە رووی نووسینیشەوە هیچ رێکار و رێکخستنێکی نییە، هەر کەسە و دەتوانێ بە ئارەزووی خۆی، بەو ئاستە زمانەوانیەی هەیتی بابەتەکان بڵاو بکاتەوە، یان ئەوەی بڵاو دەکرێتەوە تاچەند لەگەڵ پێوەرەکانی بڵاوکردنەوە گونجاوە؟؟

ئیشکالیەتێکی دیکەی سۆشیال میدیا نادیاری سەرچاوەی هەواڵ و رووداوەکانە، ئەگەر بابەتێك یان وێنەیەك تەشهیر و ناو زڕاندنی کەسێکی تێدا بوو چۆن دەتواندرێ سەرچاوەی راستەقینەی دیار بکرێت، هەروەها مامەڵەی یاسایی لەگەڵ ئەوانە بکرێت کە دووبارە بڵاوی دەکەنەوە، ئەمە وێڕای ئەوەی تا ئێستا لە زۆربەی وڵاتان یاسای پێویست بۆ رێکخستنی ئەو شێوە میدیایە نییە.

بە هەرحاڵ، ئاسۆیەکی گەش و بێ سنوور لەبەردەم میدیایی ئەلیکترۆنیدایە، بەو مانایە نا کە رۆڵی جۆرەکانی دیکەی راگەیاندن ئیلغا دەکات، بەڵام گەر نەتوانن خۆیان لەگەڵ دەرهاوێشتە و ئاسەوار و کەرەستەکانی بگونجێنن، رووبەڕووی هەڕەشەی پەراوێز و بزربوون دەبنەوە، ئەو رۆژنامە و تیڤییەی نەتوانێ سوود لە مۆبیل وەربگرێ کە خەریکە دەبێتە کۆمپیوتەرێکی گەڕۆك، تا نوێترین زانیاری و هەواڵ بە وەرگر بگەیەنێت، بێگومان داهاتووی لە لێژی دایە و تا سەر بڕ ناکات.

هەنوکە چەند دەزگایەکی میدیایی لە هەوڵی پێك هێنانی دەزگای رۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی فرە خزمەتگوزاری و تایبەتمەندین، بە جۆرێك زانیاری و هەواڵ و بابەت و داتا و وێنە...تاد بە پێی خواست و ئارەزووی تاك (وەرگر) بەرامبەر پارەیەکی رەمزی لە رێگەی بەشداری مانگانەوە بە تاك تاکی جەماوەر بدات، ئەم پرۆژە نوێیە بە کرۆسمیدیا (Cross Media) ناو دەبرێت، هەر تاکێك دەتوانێ لە رێگەی مۆبیلەکەی یان تەلەڤزیۆنەکەی، ئەو زانیارییە زۆر تایبەتەی کە حەزی لێدەکات، بەدەست بێنێ.

لە دوماهیدا دەڵێین، پێشکەوتنی داهاتووی میدیا هەرچی و چۆنێك بێ، ئەوەی بە جێگیر و نەگۆڕ دەمێنێتەوە، زەرورەت و گرنگی بایەخدانە بە شێواز و تەکنیکی نووسینی رۆژنامەوانییە، پەیامە رۆژنامەوانییەکان هەر چۆنێك بن، وەزیفە و ئامانج و کەرەستەی ناردنیان هەر چییەك بێ، دەبێ ناوەڕۆك و داڕشتنیان بە شێوەیەك بێ لەگەڵ بنەما پرۆفێشناڵەکانی نووسینی میدیایی یەکانگیر بێ.

## سەرچاوەکان:

١/ د.أحمد زين الدين، التحرير الصحافي، ط٢، دار النهضة العربية، بيروت، ٢٠١٢م.
٢/ ألبيرت هستر و واين تو، دليل الصحفي في العالم الثالث، الدار الدولية للنشر و التوزيع، القاهرة، ١٩٩٨م.
٣/ جاك موريكان، الكتابة الصحافية، ت:أنسام محمد، ط٩، دار البحار، بيروت، ٢٠١١م
٤/ د.شرف عبدالعزيز، الأساليب الفنية في التحرير الصحفي، دار القباء للطباعة و النشر و التوزيع، القاهرة، ٢٠٠٥م.
٥/صلاح قبضايا، تحرير و إخراج الصحف، ط٢، المكتب المصري المعاصر، القاهرة، ١٩٨٥م.
٦/عبدالخالق محمد علي، فن التحرير الصحفي، دار المحجة البيضاء، بيروت، ٢٠١٠م.
٧/ د.فاروق أبو زيد:
أ/ فن الكتابة الصحفية، ط٤، عالم الكتب، القاهرة،١٩٩٠م.
ب/ فن الخبر الصحفي، ط٣، دار الشروق، بيروت-مكتبة العلم-١٩٨٤م.
٨/لونارد راي تيل، مدخل الى الصحافة-جولة في قاعة التحرير، ت:حمدي عباس، ط٢، الدار الدولية للتوزيع و النشر، القاهرة، ٢٠٠٢م.
٩/ د.محمود إبراهيم و د.درويش شريف اللبان، اتجاهات حديثة في الإنتاج الصحفي، ط١، العربي للنشر و التوزيع، الجزء الأول، القاهرة، ٢٠٠٠م.
١٠/ د.معين رحال، معجم اللغة الإعلامية المقروءة و المكتوبة، بيروت، ٢٠١٢م.

١١/ د.موسى علي الشهاب، اتجاهات معاصرة في كتابة المقال الصحفي، دار أسامة، عمان-الأردن، ٢٠١٢م.
١٢/ د.نبيل راغب، فن التحرير الصحفي، القاهرة، دار غريب، ٢٠٠٥م.
١٣/ د.نسيم الخوري:
أ/فنون الإعلام و الطاقة الإتصالية، دار المنهل اللبناني، بيروت، ٢٠٠٥م.
ب/الكتابة الإعلامية، دار المنهل اللبناني، بيروت، ٢٠٠٩م.
١٤/هاوزين عمر، المقالة الصحفية، ط١، دار المنهل اللبناني، بيروت، ٢٠١٣م.
١٥/جەمال عەبدول، فەرهەنگی راگەیاندن (ئینگلیزی-عەرەبی-کوردی)، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٦ز.
١٦/ د.حەبیب کەرکوکی، هونەری رۆژنامەنووسی، و: سەمیرە ئەحمەد، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی-چاپخانەی خانی/دهۆك، ٢٠٠٨ز.
١٧/ د.مەغدید سەپان، ئەوانەی رۆژنامەنووس پێویستە بیانزانێ، چاپخانەی شەهید (ئازاد هەورامی) کەرکوك، بەرگی دووەم، ٢٠١٢ز.
١٨/ هاوژین عومەر، ئیتیکی کاری رۆژنامەوانی، خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر، ٢٠١٢ز.



## نووسەر لەچەند دێڕێکدا:

سالّی ١٩٧٩ لە دایك بووە

_هەڵگری بڕوانامەی ماستەرە لە رۆژنامەگەری لەسەر نامەی (فن المقالە الصحفیه فی جریده التیٓخی، دراسه فنیه-تحلیلیه)، زانکۆی بەیروت_لبنان.

_لە سالّی ١٩٩٨ ەوە لە بواری رۆژنامەنووسی کاردەکات، لەم رۆژنامە وگۆڤارانە کاری کردووە:

نووسەر لە گۆڤاری (زاگرۆس) ١٩٩٨_١٩٩٩ کە بەزمانی عەرەبی دەردەچوو.

پەیامنێر لە گۆڤاری (هەرێم) ١٩٩٩_٢٠٠٥.

پەیامنێر لە (گۆڤاری گولأنی عەرەبی) ٢٠٠٣-٢٠٠٤.

زمانەوان لە گۆڤاری (الصوت الاخر)ی عەرەبی ٢٠٠٤_٢٠٠٧.

ئەندامی دەستەی نووسەران، بەرپرسی فایلی کۆمەلأیەتی لە گۆڤاری گولأن ٢٠٠٧_٢٠١٠.

ئەندامی دەستەی نووسەران لە هەفتەنامەی (هەرێمی کوردستان) ٢٠٠٥_.

ئەندامی دەستەی نووسەران لە گۆڤاری (تورکیاناسی).

_چالاکوانە لە بواری کۆمەڵگەی مەدەنی و کاری رێکخراوەیی، تا سالّی٢٠١ بەرپرسی سەنتەری (رەهەند) بوو بۆ چالاکی رۆشنبیری.

_لە بواری وەرگێڕانیشدا کاردەکات، چەندین توێژینەوەی ئەکادیمی لە زمانی عەرەبییەوە بۆ زمانی کوردی، و بە پێچەوانەوەش، وەرگێڕاوە.

_سیٓ کتێبی دیکەی دەربارەی رۆژنامەگەری هەیە ئەوانیش:

١/ئیتیکی کاری رۆژنامەوانی
٢/فن المقاله الصحفیه
٣/دەروازەیەکی تیۆری و پراکتیکی بۆ رژنامەگەری رۆژانە و راگەیاندن (وەرگێڕان).
_ستوون نووس بووه له چەند رۆژنامە و گۆڤارێك.
_به وتار و بابەتی رۆژنامەوانی، بەشداری بەردەوامی له رۆژنامە نێوخۆیی وعەرەبییەکان هەیە.
_ئەندامی کارای سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستانە.
_ئەندامی فدراسیۆنی نێودەوڵەتی رۆژنامەنووسانە.
_ئەندامی سەنتەری (نور)ی رۆشنبیری و ئیعلامییە لە سوید.